٤ کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

# کورد
# لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

ئامادەکردنی
د.عوسمان عەلی

وەرگێڕانی
ڕەسوڵ ئیبراهیم و عومەر ئیسماعیل

٤

کورد لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا
ئامادەکردنی د.عوسمان عەلی

# کـــــــــورد
# لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا


ئامادەکردنی

د. عوسمان عەلی

وەرگێڕانی

ڕەسول ئیبراهیم و عومەر ئیسماعیل

**کورد و کوردستان لە سەرچاوە مێژووییەکاندا (٤)**

## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە


- **کورد لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا**
- **ئامادەکردن و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی:** د. عوسمان عەلی
- **وەرگێڕانی:** ڕەسول ئیبراهیم و عومەر ئیسماعیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٥٦٥)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨٣٤)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## پێشەکیی وەرگێڕ:

ئەگەرچی کاری وەرگێڕان کارێکی بەگرێوگۆڵـە و ئاسـان نییـە، بەتایبـەت ئەگـەر بابەتەکە بەڵگەنامە بێت. لە لایەکی دیشەوە، وەرگێڕانەکە بۆ سەر زمانی کوردی بـێ، ئەوەندەی دی ئەرکی وەرگێڕ گران دەکات، چونکە زۆر زاراوە هەیـە وشـەی کـوردی لـە بەرامبەریدا گران دەست دەکەوێت، بەتایبەت ئەو زاراوە سیاسی و سەربازییانەی کە لـە سـەردەمی دەوڵـەتی عوسمـانی بـەکار هێنـراون، بـەڵام گرینگیـی ئـەو بابەتـە (واتـە بەڵگەنامەکانی عوسمانی) بـۆ نووسـینەوەی مێـژووی کـورد و پێویسـتیی خوێنـەران و توێژەرانی کورد بەو بابەتانە هەروەك ئامادەکار و وەرگێڕی عەرەبی بـەرێز، (د.عوسمـان علی) ئاماژەی پێکردووە، وای لێکردین دوای وەرگرتنی ڕای بەرێزی کە بۆ سەر زمـانی دایك وەریبگێڕین، بەو ئومێدەی بۆشاییيەکی بچووك لـە کتێبخانـەی کـوردی پـێ پـڕ بکەینەوە، هەرچەندە لەکەموکوڕی بەدەر نییە، ڕەنگە بەشێکی کەم و کوڕییەکـەش لـە ویشکیی بابەتەکەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە هەر لە بنچـینەدا بابەتەکـە خـۆی وایـە، چونکە ئەو زمانەی پێی نوسراوە هەمووی زمانی سـەربازی و برووسـکە و بیرخـەرەوەی سەربازین و، لە لایەن کەسانی سەربازی و والییەکانەوە نووسراون، بە گشتی ئـەدەبیاتی تێدا نییە یان زۆر لاوازە، لە لایەکی دیکەوە، نەمان ویسـتووە وەك بابـەتێکی ئـەدەبی مامەڵەی لەگەڵ بکەین و زۆر دەستکاریی دەقـەکانمان نـەکردووە، بـۆ ئـەوەی سـیفەتی بەڵگەنامەیی خۆیان لەدەست نەدەن، وەکو خۆیان وەرمان گێڕاون، بۆیە ئەگەر جۆرێك لە کرچوکاڵیشی پێوە دیار بێت، ئەوە ویستراوە ئەمانەتە زانستییەکە بپارێزرێت، بەڕاستی ئەمە بە نوسخە عەرەبییەکەشەوە دیارە هەر لەبەر ئەو هۆکارە ئاماژەی پێکرا.

لایەنێکی دی کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت، ئەوەیـە کـە جـۆرە تێکەڵاوییـەکی وەرگێـڕ بـە بابەتەکـەوە دیـارە و، ڕەچـاوی زنجـیرەی مێـژوویی نـەکراوە لـە دانـانی بەڵگەنامەکان، لە لایەکی دیشەوە بە تێکەڵی لە چەند شوێنێك بەڵگەنامـەکان لەسـەر جووڵانەوەیەك یان کەسایەتییەك خراونە ڕوو، بۆ نموونە، لە سێ شـوێن بەڵگەنامـەکانی سـەر (بـەدرخان بـەگ) خراونـە ڕوو، ئێمـە نـەمان ویسـت دەسـتکارییان بکـەین وەك

ئەمانەتێكی زانستی، هەروەكو نوسخە عەرەبییەكە دامان نانەوە و یەك نەخراون، سەبارەت بە زانیاریی نێو بەڵگەنامەكانیش ئەوە تێڕوانینی كاربەدەست و سەركردە سەربازییەكانی عوسمانییە كە چۆن بۆ كوردیان ڕوانیووە؟ بۆیە بە پێویست نەزانراوە لە هەموو بارەكاندا لە پەڕاوێزدا ڕوونكردنەوە بدرێت، جگە لەوانەی كە پشتبەستوو بەچەند سەرچاوەیەكەوە لە هەندێ شوێندا ڕوونكردنەوەمان داوە، سەبارەت بە ڕێكەوتی بەڵگەنامەكانیش هەروەك ئاشكرایە، دەوڵەتی عوسمانی ڕۆژژمێری كۆچیی بەكار هێناوە، كە ئێمە لە بەرامبەر هەر ساڵێكدا ساڵە زایینییەكەشمان بۆ زیاد كردووە، وەك ئاسانكاری بۆ خوێنەران، بەو هیوایەی توانیبێتمان سوودێكی بچووك بە مێژووی نەتەوەییمان بگەیەنین، ئومێد دەكەین كە خوێنەرانیش بە گەورەیی خۆیان لە كەموكوڕییەكانمان ببوورن.

وەرگێڕانی كوردی
٢٠١١/٩/٩ز

## بایەخی بەڵگەنامەکانی عوسمانی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد:

بەڵگەنامەکانی عوسمانی (ئەگەرچی بەگشتی فەرامۆش کراون) سەرچاوەیەکی بنچینەیی لە سەرچاوەکانی نووسینەوەی مێژووی نوێی کورد و کوردستان پێك دەهێنن، لەبەر ئەوەی عوسمانییەکان هەر لەسەرەتاکانی شەڕی مێژوویی چالدیرانەوە و لە ساڵی (١٥١٥ز)وە هەژموونی خۆیان بەسەر زێدی کورددا سەپاندبوو، فەرمانڕەواییشیان ماوەیەکی زۆری خایاند، بەو هۆیەشەوە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر توانستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی کورد بەجێ هێشتووە، بۆیە ئەرشیڤەکانیان بەسەرچاوە سەرەکییەکانی مێژوو دادەنرێن و، پێویستە ئەو نووسین و پەڕاو و بەڵگەنامانەی کە تایبەتن بە کورد بەگشتی جیا بکرێنەوە و کاریان لەسەر بکرێت، بەتایبەتی گەڕانەوە بۆ سەریان بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی نووسینەوەی مێژووی نوێی کورد دەبنەوە، کە دەتوانرێت چارەسەری بەشێك لەو گرێکوێرە مێژووییانە لەو بەڵگەنامانەدا بدۆزرێنەوە، هەروەها پشتبەستنی لە ڕادەبەدەری هەندێ لە توێژەرانی باکووری کوردستان لە توێژینەوەکانیاندا بە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا و ڕووسیا گومانی زیاتری لەسەر ڕووداوەکان بەجێ هێشتووە، کە ئومێد دەکەین بەگەڕانەوە بۆ بەڵگەنامەکانی عوسمانی ئەو گومانانە نەمێنن.

بەڕاستی هەر گەلێك خاوەن بەڵگەنامەی تایبەت بە خۆی نەبێت، ئەوا بەشێکی گەورەی بیری مێژوویی خۆی لەدەست داوە، گەلی کورد خاوەن زەخیرەیەکی گەورە و دەوڵەمەندی زانیارییە، کە بەنێو زوربەی وڵاتانی جیهاندا بڵاو بووەتەوە، بۆیە بەربەستێك نییە کە هەموومان لەخۆبردووانە کار بۆ دەرخستنی ئەو زەخیرەی زانیارییە بکەین، کە لە کۆگای پەرتووکخانە تایبەتی و گشتییەکانی جیهاندان، وەگێڕانەوەی ئەوەی دەتوانرێت بگێڕێتەوە وەیان پاراستنیان لەو بنکانەی کە لەمبارەیەوە ڕۆڵ دەگێڕن، بێگومان دەتوانین کار بکەین بۆ زیندووکردنەوەی ئەو کەلەپوورە زانستییە و گشتاندنی بەسەر دام و دەزگا زانستی و فێرکارییەکاندا و، بڵاوکردنەوەی بە شێوەیەکی بەرفراوان لەنێو توێژی ڕۆشنبیران و ئەوانەی بایەخ دەدەن بە توێژینەوە نەتەوەییەکان و کار دەکەن لە بوارەکانی لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا و، پێویستە هەوڵێکی چڕی زانستی بخرێتە گەڕ، لە لایەن لێکۆڵەرەوانی کورد و دامەزراوە فەرمییەکانەوە کە تایبەتمەندن بە

بواری وەرگێڕانی بەڵگەنامەکانی بەریتانی و ڕووسی وعوسمانی تایبەت بە کورد و کوردستان، بە جۆرێك کارکردن لەم بوارەدا گرینگە، کە زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین، ئەو توانایەی لەم بوارەدا خەرج دەکرێت هیچی کەمتر نییە لەوەی بۆ گێڕانەوەی ناوچە نەوتییەکانی کوردستان خەرج دەکرێت.

لێرەوە بۆ ڕزگاربوون لەو کەمتەرخەمییەی درکی پێدەکرێت سەرنجی خوێنەران بۆ گرتنەبەری چەند ڕێوشوێنێك ڕادەکێشم:

**١- هاندان لەسەر ئەنجامدانی (ئامادەکردنی) توێژینەوەی مێژوویی کە پشت بە سەرچاوەکانی ئەرشیڤەکانی عوسمانی دەبەستن.**

١. بانگکردنی زانکۆ و مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەی باشووری کوردستان، بۆ بایەخدان بە توێژینەوە لە مێژووی عوسمانییەکان، لە ڕێگەی کردنەوەی خولی تایبەت بە فێربوونی زمانی تورکی عوسمانی، بە هاوکاری لەگەڵ پسپۆرانی ئەو بوارە، بۆ ئەوەی توێژەری کورد بە دڵنیاییەوە سوود لەو بەڵگەنامانە وەربگرێت.

٢. پێویستیی گرێدانی پێوەندیی زانستی ووۆرك شۆپ و دانیشتنی ڕاستەوخۆ لەنێوان مێژوونووسان و بیریارانی کورد و تورك، بۆ دەستەبەرکردنی ئەنجامی باش و لێك نێزیکبوونەوەی نێوانیان و پتەوکردنی پێوەندیی مێژوویی لە نێوان ئەو دوو گەلەدا.

٣. بانگهێشتکردنی لایەنە دیپلۆمات و حوکمییەکانی تورك، بە مەبەستی کارئاسانیی پێویست بۆ توێژەرانی کورد، بۆ ئاگاداربوون لە ئەرشیڤەکانی عوسمانی.

بەڵگەنامە و نووسینەوەی مێژوو:

بەر لەوەی لە گرینگترین بەڵگەنامە و دۆسییەکانی عوسمانی تایبەت بە کورد و کوردستان بدوێم، پێویستە ئەگەر بە شێوەیەکی کورتیش بێت لەسەر گرینگیی بەڵگەنامە لە نووسینەوەی مێژوودا بووەستین، چۆنییەتی لێکۆڵینەوە لە بەڵگە لە لایەن لێکۆڵەرانەوە بە شێوەیەکی بابەتییانە.

سەرباری ئەوەی ئەمرۆ جیهان لە شۆرشێکی زانستیی تازە و هەمەلایەنەدا دەژیەت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەنامە کۆنەکان بایەخی خۆیان پاراستووە و، گرینگترین سەرچاوەیەکن کە توێژەران لە لێکۆڵینەوەکانیاندا پشتیان پێ دەبەستن، بەڵگەنامەکان ڕابردوو وا دەخەنە ڕوو، وەك ئەوەی لەنێو ڕووداوەکاندا بژین، بەجۆرێك

بەدواداچوون و چاودێریکردنی پێشکەوتنەکان و هەڵوێست وەرگرتن لەبەرامبەریدا و، هەتا دەرکردنی هەندێ بڕیار لەژێر کاریگەریی بەڵگەنامەکاندان، هەربۆیە لەبەر گرینگیی بابەتەکە و بە مەبەستی پاراستنیان لە لەنێوچوون، لە سەدەی ڕابردوودا چەندین دەزگا و دامەزراوەی جیهانیی تایبەت بە گرینگیدان بە ئەرشیڤی گەلان دروست بوون، یەکێك لە گرینگترین ئەو دامەزراوانەش کە لە ساڵی (١٩٥٨ز)دا دامەزراوە، بریتی بوو لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ پەروەردە و فێرکردن، کە بە (یونسکۆ) ناسراوە.

چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە بە یەکەم هەوڵێك دادەنرێن کە تایبەت بە ئەرشیڤ ئەنجامی دان، هەنگاوی یەکەمیشی بەبانگهێشتکردنی کۆمەڵێك پسپۆڕ و شارەزای وڵاتان بوو لە ساڵی (١٩٨٤ز)؟، بە مەبەستی ڕاوێژکردن دەربارەی ئەرشیڤکردنی بەڵگەنامەکان و پێویستیی و گیروگرفتەکانی بەردەمیان، دوای گفتوگۆکردن لەسەر ئەم بابەتە ئەوانیش پێشنیاری دامەزراندنی (ئەنجوومەنی نیودەوڵەتی بۆ ئەرشیڤ)یان کرد، کە لە هەمان ساڵدا دامەزرا و یەکەم کۆنگرەی نێودەوڵەتیی خۆی بەست، هەروەها یونسکۆ یەکەی (مایکرۆ فلیم)ی دامەزراند و لەژێر چاودێریی دەوڵەتە ئەندامەکانی داینا، بۆ دڵنیابوون لە پاراستنی ئەرشیڤ و کەلوپەلە دەگمەنەکانی کتێبخانەکەی و، ئەو یەکەیە لە چالاکییەکی دیدا دەستی کرد بە وێنەگرتنی (مایکرۆ فلیمی ڤیدیۆیی) لەچەند وڵاتێکی ئەمریکای لاتین و نیشتمانی عەرەبی و ڕۆژهەلاتی ئاسیا، بلاوکردنەوەی یەك ملیون لاپەڕە لەو دیکۆمێنتە وێنەگیراوانە.

کاری سەرەکیی دووەمی یەکەکە بە هاوکاریی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی بۆ ئەرشیڤ بریتی بوو لە پڕۆژەیەکی درێژخایەن، کە تایبەت بوو بە ئامادەکردن و بلاوکردنەوەی زنجیرەیەك لەسەر مێژووی نەتەوەکان، زنجیرەی یەکەمیشی لەسەر مێژووی ئەمریکای لاتین و دواتریش لەسەر ئەفریقا و باشووری بیابان و ئاسیا بلاوکردەوە، هەوڵی سێیەمیشی خۆی لە پاڵپشتکردنی بلاوکردنەوەی چاپەمەنییەکانی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی بۆ ئەرشیڤدا بینییەوە، بۆ نموونە، وەك گۆڤاری بەناوبانگی (Archivum ) و پاڵپشتیکردنی لە بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە و ئەرشیڤەکانی یونسکۆ بوو، هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە لە ساڵی (١٩٧٦ز)وە، یونسکۆش لەم بارەیەوە ڕۆڵی دیاری

بینیووە، لە کردنەوەی خولی جۆراوجۆر و بەستنی کۆڕەوە لەساڵی(١٩٧٧)دا پرۆژەی بە یەکەوەگرێدانی چالاکییەکانی بەڕێوەبەریەتیی کتێبخانەکان لەگەڵ (یونیست...؟) بوو، بۆ ئەوەی ببنە بەرنامەیەکی گشتی بۆ زانیارییەکان (PGI)، دیارترین دەستکەوتی ئەو بەرنامەیەش لە ساڵی (١٩٧٩ز)دا بریتی بوو لە بەرنامەی بەڕێوەبەرایەتیی بەڵگەنامەکان و ئەرشیڤ (RAMP).

بە هەرحاڵ، بەڵگەنامە بریتییە لە ڕاگر و کرۆکیی مێژوو، بۆیە لە کاتی نەبوونی یان دەستەبەرنەکردنیدا پێویستە مێژوونووس بێدەنگ بێت، چونکە ئەو بەڵگەیە لەدەست دەدات کە ڕوونکردنەوەی ناوێت، مێژوونووس بەبێ بەڵگەنامە وەکو دادوەرێکە لە دادگادا، کە بۆ دادگەریکردن لەنێوان سکاڵاکەر و تۆمەتباردا لەسەر کێشەکەیان شاهیدیان نەبێت، بەڵام هەرچەندە بەڵگەنامە وەك شاهیدێك وایە لەسەر ڕووداوەکانی نێو مێژوو، سەرچاوەیەکی بنچینەییە لە نووسینەوەی مێژوودا، بەڵام ناتوانێت مێژوو دروست بکات، چونکە بە ئاگاداربوون لە تەنیا لایەنێك ناتوانرێت بڕیار لەسەر لایەنەکانی دی بدرێت و، گرینگیی خۆی لەدەست دەدات. کاتێك بە شێوەیەکی هەرەمەکیی یەك لەپاڵ یەکدا دادەنرێن، ئەگەر وشەکان ڕێك نەخرێن و ڕستەی تەواو پێك ناهێنن، تەنانەت ڕستەی تەواویش مانا نابەخشێت ئەگەر بە شێوەیەکی لێزانانە و ڕێکوپێك نەخرێنە پاڵ یەك کە بمانگەیەنەتە مەبەستی دیاریکراو.

لێرەدا ئەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە کە بەڵگەنامەکان بە تەنیا شایەنی ئەو تایبەتمەندییە نین، چونکە دەکرێت وەك هەر دەقێکی دی شیاوی کەموکوڕی بن، بۆیە مێژوونووسیش پێویستە ژیر و لێهاتووبێت، بۆ گرتنی ڕەخنەی ناوەکی و دەرەکی باش و خراپ لە ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان، شرۆڤەکردنیان بە مەبەستی گەیشتن بەڕاستی ڕووداوەکان، بەمەش دەتوانرێت جیاوازی بکرێت لە نێوان بەڵگەنامەی مێژووی بە سوود و ئەوانەش کە مەبەست لێیان خزمەتکردنی ڕاگەیاندنە فەرمییەکان بووە لە کاتی خۆیدا و، پێویستە مێژوونووس لەکاتی خوێندنەوەیاندا جیاوازی بکات لە نێوان هەست و ئارەزو و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی نووسەری بەڵگەنامەکان و ئەو ڕاستییە مێژووییانەی کە لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا هاتووە، یان ئەو ڕووداوە ڕاستەقینانەی کە نووسەرەکانیان شاردوویانەتەوە، ئەمەش پێویستی بە ئەزموون و لێهاتوی و زانینی

پێشوەخت هەیە بەڕاستی گرینگترین دروشمەکانی فەرمانڕاوای ناوچەکان لە ڕووی سیاسی و کارگێڕییەوە، لەگەڵ پوختەیەك لە ژیاننامەی کەسایەتییە فەرمانبەدەستەکانی هەر ناوچەیەك.[1]

## کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا:

وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامە هەڵبژێراوانە زیاتر لە دە ساڵی خایاندووە لە لەندەن، بە هۆی پێداچوونەوە و نووسینەوە و بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەوانەی کە لە خانەی بەڵگەنامە گشتییەکانی بەریتانیادا لە( Office India & Office British Museum Public Record )دا هەبوون، کە پێوەندیدار بوون بە کورد و کوردستان، ئەمەش سوودێکی زۆری پێگەیاندین لە چۆنییەتی گەڕان بە دوای بەڵگەنامە عوسمانییەکانی پێوەندیدار بە کورد، لە ماوەی سەردانەکەماندا بۆ خانەی بەڵگە عوسمانییەکان لە ئەستەنبول کە بە باشبقالنق(Besbakanlik) ناو دەبرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو یاسایەی لە ڕێکخستن و شێوازی بەشبەشکردنی بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا پشتی پێ بەستراوە بە بەراورد بە یاسای بەریتانی لە قۆناغێکی سەرەتاییدایە، بەڵام لێکۆڵەر لە چەند لایەنێکەوە سوودمەند دەبێت و زانیاری وەردەگرێت، وەك سوودمەندبوون لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ بەڵگەنامەکان و، ناسینی پێشینەی زۆربەی ئەو کەسایەتییە عوسمانیانەی کە لە ڕووداوەکانی پێوەندیدار بە کورد و کوردستان ڕۆڵیان بینیووە.

لە ماوەی لێکۆڵینەوەماندا لەبەڵگەنامە عوسمانی و بەریتانییەکان[2] گەیشتینە ئەو ڕاستییەی کە جیاوازیی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، چونکە سیاسەتێکی ڕوون و جێگیر کە لە لایەن دەزگاکانی بەریتانیاوە سەبارەت بە بارودۆخە سیاسی و کارگێڕییەکان دارێژراوە، کە لە بەڵگەنامەکانیاندا بەرچاو دەکەوێت، بە مەبەستی هێنانەدی

---

(١) بڕوانە: مشری العانی، من الوثائق العثمانية فی تاريخ الجزيرة العربية" الصوت الأخر، عدد(٤٩)، أربيل،٢٠٠٥/٥/٣٠م.

(٢) خاوەنی ئەم کتێبە واتە (د.عثمان علی) سەرچاوەیەکی دی بە نرخی لەسەر کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا پێشتر بڵاو کردووەتەوە.

ئامانجێکی دیاریکراو بۆ ئەو دەوڵەتە و، هەروەك لە بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێت کارمەندانی بەریتانیا بەجێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەوە وابەستە بوون کە لە لایەن دەوڵەتەکەیانەوە بۆیان دیاریکراوە، بە پێچەوانەوە کارمەندانی عوسمانی پەیوەست نەبوون بە سیاسەتی دەوڵەتەکەیان، بەڵکو هەر یەکە لە والی و کاربەدەستەکانی دی ڕێڕەوێکیان گرتووەتەبەر کە خزمەت بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان کردووە و، هەوڵیان دەدا کەسانی دی لەپێناو خزمەتکردنی خۆیان بەکار بهێنن و، زیاتر لەوەش پەنابردنیان بوو بۆ وەرگرتنی بەرتیل و باج لە خەڵك، کە ئەویش تەنیا دەچووە گیرفانی والییەکانەوە و، هەر کەسێك ئەو بەڵگەنامانەی کە لەسەر سەرژمێریی ماڵ و پارە و دەستکەوتەکانیان هەن بخوێنێتەوە سەری سوڕدەمێنێ، لەکاتێکدا تەنیا بەڵگەنامەیەکیش لەسەر سەرژمێریی دانیشتوان و دەزگا فێرکاری و تەندروستییەکان نییە.

لەڕاستیدا کاری بەشبەشکردن و پۆلێنکردنی بەڵگەنامەکانی عوسمانی کە زیاتر لە (١٣٠) ملیۆن بەڵگە دەبن، بە پێی بنەماکانی زانستی تازە کە هاوشان بێت بە ڕژێمی کتێبخانەکانی بەریتانیا و ئەمریکا، پێویستی بەهەوڵ و تێکۆشانی نەوەی داهاتوو و بارودۆخێکی دیموکراتی زیاتر هەیە، وەك ئەوەی ئێستا لە تورکیا هەیە، هەرچەندە لە لایەن لێکۆڵەرانەوە چەند هەوڵێك دراوە بۆ دابەشکردنی بەڵگەنامەکان بەسەر هەرێمی جوگرافی و کارگێڕی و جیوسیاسیدا، بەڵام لە پۆلێنکردنیاندا کەمتر پشت بە پلەبەندیی کات بە پێی ساڵەکانی کۆچی و عوسمانی و ساڵنامەی گرگۆریی ڕۆژئاوا بەستراوە.

بەهەر حاڵ توێژەر لە ماوەی چاوخشاندنی بە بەشێك لەبەڵگەنامەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستدا، بە شێوەیەکی گشتی بۆی دەرکەوتووە کە بەڵگەنامەکان لەو بەندانەی خوارەوەدا کورت کراونەتەوە:

أ- خەتی همایۆنی (بەڵگە نامەی سەردەمی ڕێکخستنەکانی ساڵانی ١٨٣٩-١٨٥٦ز) دەگرێتەوە، کە بریتین لەو ڕاپۆرتە نێردراوانەی نووسینگەی بابی عالی (سکرتاریەتی نووسینگەی صەدری ئەعزەم- سەرۆك وەزیرانی عوسمانی) بۆ دیوانی سوڵتان و چاوخشاندنەوە پێیاندا، کە ئەمانە دەگرێتە خۆ:

١- نامەی همایۆن و دەفتەردار (تۆماری نامە نێردراوەکان لە والی سوڵتانەوە).

٢- شاه بەندەر دەفتەردار (ڕێنماییەکانی سوڵتان بۆ کونسوڵخانەکانی عوسمانی).
٣- ئەو دۆسیانەی کە لە لایەن ئەنجوومەنی وەزیرانەوە پێشکەش بە سوڵتان دەکران بۆ بڕیاردان لە سەریان.
ب- ئیرادات کە (٣٥٠) هەزار دۆسیە و ڕاپۆرت لە خۆ دەگرێت (کە وەك ڕێنمایی بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سوڵتان دەرچوون)، کە دەتوانین دابەشیان بکەین بە سەر ئەمانەی خوارەوەدا:

- ولایی ئەحکام عدلییە (وەزارەتی داد).
- مەسائیلی مهمە (دۆسیەی کێشە تایبەت و گرینگەکانی پەیوەست بە ئاسایشی دەوڵەتەوە).
- شورای دەوڵەت (دۆسیەکانی ئەنجوومەنی ڕاوێژی عوسمانی).
- مەجلسی کلام (ئامادەکاری دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی وەزیران).
- مجلس مخصوص وكلاء(دۆسیەکانی ڕاوێژکاری وەزیرەکان).
- عسکری (کاروباری سەربازی و هەڵمەتە سەربازییەکان).
- سراء(کاروباری کارگێڕی لە کۆشکی سوڵتاندا).
- أوقاف (کاروبارە ئاینییەکانی عوسمانی).
- بحریە (بەڵگەنامەکانی کەشتیوانیی عوسمانی).
- داخلیەی سیاسیە (وەزارەتی ناوخۆ و کاروباری سیاسی).
- داخلیەی ئیداریە (وەزارەتی ناوخۆ و کاروباری کارگێڕی).
- داخلیەی شفرە (برووسکە نهێنییە جۆراوجۆرەکان).
- داخلیە قلم مخصوص (ئەو ڕاپۆرتانەی کە ڕووبەڕووی وەزارەتی ناوخۆ دەبنەوە تایبەت کە بە هەندێك کاروبارەوە تایبەتن).
- داخلیە (هەواڵگریی گشتی).
- خارجیە-قلم مکتوبی (وەزارەتی دەرەوە — ڕاپۆرتەکانی سکرتارییەت).
- ئیداریە داخلیە (ئەو بڕیارانەی کە لە وەزارەتی ناوخۆوە دەردەچن).
- ئیرادەت عسکریە (فەرماندەی ئەرکانی گشتیی جەنگی).
- پۆلێنکردنی ئیرادات (ئیراداتی تایبەت و بابەتە هاتووە گرینگەکان).

- يلدز قنوع (پەڕاو بەڵگەنامەکانی کۆشکی سوڵتان لە ئەستەنبوڵ).

**بەڵگەنامەکانی تایبەت بە کوردستان:**

لێکۆڵەر نەیتوتوانیوە بەڵگەنامەکانی سەرەتای فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لە کوردستاندا بەدەست بێنێت، کەوا پێدەچێت زۆر دەوڵەمەند بن و وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی ناتوانرێت فەرامۆش بکرێن، بەڵام لێرەدا ئاماژە دەکەین بەو پۆلێنکردن و خاڵبەندییەی بەشێك لە بەڵگەنامەکانی تایبەت بە سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم کە دەستمان کەوتوون و، پووختەی ئەو بەڵگەنامانە لە ( Basbakanlik Osmanli Arşivi) لە ئەستەنبوڵ هەن، هەروەکو لەمەودوا ڕوون دەبێتەوە کە بە زۆری پشت بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ بەتایبەتی فەرمانگەی هەواڵگریی گشتی و فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی بەستراوە، کە چەندین دۆسیەی هونەری دەربارەی بزووتنەوە کوردییەکان لە سەدەی نۆزدەدا دەگرێتە خۆ، کە وا دەردەکەوێت کێشەی کورد لە سەدەی ناوبراودا بە تایبەت (جووڵانەوەی بەدرخان پاشا و یەزدان شێر و شێخ عوبەیدوڵا و سوارەکانی حەمیدییە) پانتاییەکی زۆریان لە گرینگیدانی عوسمانییەکان پێیان داگیر کردووە، هەروەکو ڕاپۆرت و دۆسیەکانی عوسمانی ئاماژەی پێ دەکەن و، لە ماوەی ساڵانی (١٨٤٨-١٨٦٧ز)دا ولایەتێك بە ناوی کوردستانەوە هەبووە، بۆیە بەشێکی زۆری نێردراوە فەرمییەکانی حکوومەت بەتایبەتی نێردراوە ناوخۆیی و جەنگی و تەلەگرافییەکان پێوەندیدار بوون بەو ویلایەتەوە و، ڕاپۆرتی تێروتەسەل لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کورد نووسراون، لێرەدا مەبەستمان بەتایبەت دۆسیەکانی ساڵنامەیە و، بۆ سوودبینینی زیاتر ئاماژە دەکەین لە دۆسیەکانی ژێر دەستمان کە سوودمان لێ وەرگرتوون لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەماندا لە باشباقالنق (بەڵگەنامەکانی سەرۆك وەزیران لە ئەستەنبوڵ[٣]

---

(٣) بەپێویست نەزانراوە ناوی بەڵگەنامەکان لێرە بنوسرێتەوە بۆ ناوی دۆسیەکان بڕوانە: هەمان ئەم سەرچاوەیە بە زمانی عەرەبی، ل١٣-ل١٥.

## ((بەڵگەنامەکان لەسەر شێخ سەعیدی حەفید))

Irade-Husus

Za B1311-102 ٢٢

کۆشکی یلدز هومایونی — سەرۆکایەتیی فەرمانگەی نووسین:

ئەو (زاویە) پیرۆزەی کە شێخ سەعید، نەوەی کاك ئەحمەدی شێخ سەرپەرشتیی دەکات، لەدانیشتنێکدا داوای کردووە کە جیاکاری لە باجەکانی سەر موڵکەکانی لە خانوبەرە و زەوی و سامانی ئاژەڵەکانی بۆ بکرێت، کە خوالێخۆشبووو ئەحمەد ئەفەندی یەکێکە لەسەیدە بەڕێز و کەسایەتییە دیارەکان و، کاری لەسەر بڵاوکردنەوەی زانست و گرتنەبەری ڕێوشوێنی ئاینی کردوە و، هەوڵی بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئاینزای شیعە لە ناوچەکەدا داوە و، لە سەرووی ئەوەشەوە خزمەتێکی بەرچاوی پێشکەشی ناوچەکە و دەوڵەت کردووە، هەروەك نەوەکەی (شێخ سەعید) ڕێوشوێنی باپیری گرتووە لە بانگەوازی بۆ چاکە و پاراستنی ڕێز و شکۆمەندیی سوڵتان، ئەویش بەڵێنی بە بڵاوکردنەوەی زیاتری زانست و فێرکردن و ئەحکامە دیارەکانی ئاین داوە و، ڕێی لە بڵاوبوونەوەی ئاینزای شیعە لە ناوچەکەدا گرتووە، خەلیفەی خاوەن شکۆ وای دەبینێ کە دەبێت مامەڵەیەکی گونجاو لەگەڵ خانەوادەی خوالێخۆشبوودا بکرێت، بە شێوەیەکی نەرم و نیان کە شایەن بەوان بێت، بەڵام نابێت تێکەڵاوی و بێسەر و بەرەی لەو هەوڵسوکەوتانەی کە پێویستە ئەنجام بدرێن ڕوو بدات، بۆ ئەوەی وەك هەل نەقۆزرێنەوە.

ئەو ڕوونکردنەوەی کە لەبارەی سەرانەی ساڵانەی سەر زەوی و زار و ماڵ و مەڕوماڵاتی پێوەندیدار بە شێخ سەعیدی حەفید و براکانییەوە درا، بڕەکەی (٢٨٥٠٠) قرش بوو، ئەوەی پێویستە ئیرادەی سونی لەم بارەیەوە ئەنجامی بدات ناردنی فەرمانەکەیە لە لایەن ئەنجوومەنی بریکارەکان تایبەت بەو بابەتە و دەرخستنی ئەنجامەکەی، وەگێڕانەوەی بڕیارەکەیە بۆ لایەنی پێوەندیدار، ئەمەش بە فەرمانی خاوەن فەرمانە.

٢٨ی **ذی القعدة** ساڵی ٣١١ (١٨٩٣ز)/٢١ ی ئایاری ساڵی ٣١٠

**Y.MTV .114/ 31**

**وێنەی وڵامی ئەو برووسکە نهێنییەی کە لە ولایەتی موسڵەوە هاتبوو:**

ج /٦ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٨٩٢/٣١٠ز[٤] ئەو برووسکەیەی کە باس کرا، لە لایەن مەحمود پاشا لە خانقین و قزل ڕباتەوە نێردراوە، لە ڕێکەوتی (١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣١٠ و، ١ی کانوونی دووەمی ٣١٠) دوێنی هەردووکیان گەیشتن و چاومان پێدا خشاندن و، کۆمەڵێ دەستەواژە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرابوو، کە ئاماژەیان بە بوونی ناکۆکی لە نێوان پاشا و شێخ سەعید ئەفەندی کردووە و، ئاماژەی بە پاڵپشتیی هەندێ لەو کەسایەتیانە داوە، بە تایبەت ئەوانەی قسەیان دژی شێخی ناوبراو کردووە، بەڵام مەبەستی پاشا گەیشتن بە سەرۆك خێڵیەتی جاف بوو، لە سەرووی پلەی قائم قایمیەتی کلعنبر، ئەوەی کە هەردووکیان گومانیان لێ دەکرد بۆ ئاسانکردنی کارەکە، ئەوە بوو کە پەنا ببەنە بەر ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی زیادکردنی لایەنگر و هاوپشتیوانان و، بەرزکردنەوەی سکاڵا دژی سەرۆك خێڵی جاف و عوسمان پاشای قائمقامی ئێستای کلعنبر، بەڵام ڕێگری لە بەردەم ئەم کارە کە هەمیشە ئاماژەی بۆ دەکرا، ئەوە بوو کە کێبڕکێ بەردەوام لە زیادبووندا بوو لە سەر وەرگرتنی سەرۆکایەتیی لەنێو خێڵی جافدا، بەمەش لەدواییدا کارەکە بۆ بابەتێکی سیاسی گۆڕابوو، تکایە ئاگاداری.

١٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣١٠
عزیز پاشا —والی موسڵ

(٤) ڕێکەوتی مانگەکە زایینە و ساڵەکەی کۆچییە، بێ گومان ساڵی مانگی (کۆچی) و ڕۆژیش (شمسی) دە ڕۆژ جیاوازییان هەیە، بۆ بەراوردکردنیشیان پشت بەسەرچاوەکەی گ.س.فریمان-گرێنفیل بەستراوە، ڕۆژژمێرەکانی کۆچی وزایینی و، لە فەڕەنسیەوە نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

Y-MTV. 114/ 31

لــە برووســکەیەکی مــەحمود پاشــای جــا[٥]دا بــە نووســراوی ٣ی کــانوونی یەکــەمی ساڵی١٨٩٢/٣١٠ز دا هاتووە: هەندێ پیاوخراپ بڕوبیانوو دەدۆزنەوە بۆ خراپەکانیان، ئەگەر داوام لێ بکەن بــە درێــژی دەیخەمــە بەردەســتتان، بــۆ مەبەســتی هەقیقــەتی ئــەو حاڵەتــە نووسراوێکم نووسی و بە برووسکە لە ڕێکەوتی ١ی کانوونی ساڵی ١٣١٠ك ناردم، بــاس لــە هۆی ناکۆکی و ڕکابەری بەردەوامی نێــوان شــێخەکانی سلێمانی شــێخ ســەعید و نــەقیبی برا[٦]کردووە، داوای یارمەتیان لێ کردووە، لەگەڵ هەندێ هەڕەشە، ئەو کارە خراپانەی ئــەوان دەیکەن پەشێویان لەنێو هۆزەکاندا بڵاوکردۆتــەوە و بوونەتــە هــۆی گــەڕەڵاوژە لــە ئیــدارەی لیوادا، داوای دوو برووسکەکەمان لەو شوێنەی کە لێوەی هــاتبوون کــرد، دوای ئــەوەی کــە بینیمانن داوامان لە ولایەتی موسڵ کرد برووسکەیەکی نهێنی بنێرێت لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەو ڕا و بۆچوونە و، لە وڵامی ولایەت و ئەو دوو برسکەیە دەردەکــەوێت کــە پاشــا نــاوبراو هەوڵ دەدات بۆ زیــادکردنی لایــەنگرانی لــە لایــەك کۆکردنــەوەی ســکاڵا لــە دژی براکــەی (عوسمان پاشا) سەرۆکی خێڵی جاف و قائم قامی ئێستای کلعنبر، بۆ ئــەوەی ســەرۆکایەتیی خێڵ و پۆستەکەی لێ بسێنێتەوە و خــۆی بچــێتە شــوێنی و، بــە گــوێرەی ڕوونکردنەوەکــە بەردەوامبوونی ئەو بارودۆخە سەردەکێشێت بۆ ئەوەی کارەکە بگۆڕێت بە کارێکی سیاســی، بۆیە من وای دەبینم گرژی لە ویلایەتەکە نەهێڵێن و ئەو لە ویلایەتی موســڵ دوور بخەینــەوە هەتا کاری جەرگبڕانە ڕوو نەدات، لە یەکێك لــە ویلایەتــەکانی بەغــدا بیکــەن بــە قایمقــام، فەرمانی دوایی هەر چۆنێك بێت، هی گەورەمان وەلی عەهدی هەموو لایەکە.

٥ی شەعبانی ساڵی ٣١٢ و ١٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩٤ز

یاوەرانی بەڕێز حەزرەتی مەولانا سوڵتان: دەرێش

---

(٥) بە هۆی بەرفرەوانبوونی سنووری دەسەلاتی فیودالی و هەژمونیی بنەماڵەی شــێخ ســەعید، جافــەکانیش کەوتنە بەربەرەکانی ئەم بنەماڵەیە و حەزیان بەبالا دەستیان نەدەکرد، ئەمەش بۆتە هۆی ململانێی خێڵــەکی لە نێوانیاندا، بۆ زانیاری بڕوانە:م.ر.هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، لنــدن، ١٩٩٠، ب١، ل٢٠٢. و.

(٦)مەبەســت شــێخ مــارف نەقیبــە یــان مســتەفا نــەقیب، کــە هــەردووکیان بــرای شــێخ ســەعید بــوون، بڕوانە:م.ر.هاوار، شێخ محمودی قارەمان، ب١، ل١٢٦. و.

Y.MTV. 114\31

**بۆ حـــەزرەتی دەرویش پاشا، یاوەری بەڕێز مەولانا سولّتان، ج ٧ کانوونی یەکەمی ساڵی ٣١٠/:**

مەبەستم لە هەردوو برووسکەی پیشوو بۆ دەربڕینی ئامادەیی بوو لەگەڵ برا و کوڕ و هۆزەکەم لە قوربانیدان بە هەموو توانامانەوە بۆ ڕێزی سولّتان، ئەوە پێنچ ساڵە خـۆم و باب و باپیرم پابەندین بە خزمەتکردن لە سنووری دەوڵەتی عیللی عوسمانی، ئەمەش بۆ هەمیشەییە، بەڵام شێخ سەعید و نەقیبی برای داوایان لە من کردووە یارمەتییان بـدەم لەو ململانێ و ئاژاوەی ئێوە لێی ئاگادارن کە لە نێوان شـێخەکانی سـلێمانیدا هـەی(٧) شێخ وای دادەنێ یارمەتی بدەم هەتا ئەگەر چارەگران بم لە لای پایـەی بـاڵا ئـەو کـات داوای لێبوردنم بۆ بکات، ئەگەر یارمەتیشی نـەدەم ئـەوە هـەوڵ بـدات عـەریزە بداتـە مابینی هومایونی بـۆ ئـەوەی مـن دوور بخەنـەوە، هـەروەها هەڕەشـەی کۆکردنـەوەی نووسینی عەریزەی خەڵکی تریشی لێ کردووم، لە کۆنەوە ئەو شـێخانە پێویسـتیان بـە سـۆزی بـاب و بـاپیرانی مـن بـووە، پـەروەردە و مەنسـووبەکانی ئەوانـە بـەخۆیان و خزمانیانەوە لەسەد خێزان زیاتر نین و لەئاست ئیرادەی سونی دا هیچیان لە باردا نییـە، سەرەڕای بەردەوامی لەسەر ئاژاوەگێڕی ئێستا سەغڵەتن و بیر دەکەنەوە داوای پاسـەوان بکەن، ئەوانیش لەسەر ئاژاوەگێڕی و گەندەڵی هەربەردەوام بن و دەیانەوێ تـابوورێکیش سەرباز بە خۆیانەوە سەرقاڵ بکەن و ئاڕاستەی ڕەزامەندی هەنـدێ کەسـیش لەبەرانبـەر گەورەیتان بگۆڕن، ئەوکاتەی لە خانەی بەختەوەری (دار السـعادە) بـە هـۆی خزمێکـی سولّتان بە نـاوی ئـەمین بـەگ بـە ئامـادەبوونی پاشـا و کـاتبی یەکـەم ئـەو بابەتـەم خسـتەبەردەم بـەڕێز مـەقامی خەلافـەت، خراپـی بـاری عێـراق لـە لای هـەموو ئـەو بەرپرسانەی سەردانی ناوچەکەیان کردووە ڕۆشنە، بۆ ئەو کۆسپە ئاژاوەگێڕی و گەنـدەڵی قسەم لەگەڵ ئەو هۆزانە کردووە کە ئەو هانیداون و بوونەتە هۆی خراپیی باری گشـتیی ئیداریی لیوا، زۆر شت هەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە و ناتوانم بە هۆی نـەبوونی

---

(٧) بەردەوام کێشە لەسەر زەوی و زاری ململانێـی خێڵـەکی هـەبووە، کـە زیـانی زۆریشـی بـە پەیوەنـدیی خێڵەکیان بەرامبەر دوژمنی هاوبەشیان گەیاندوە، بڕوانە:م.ر.هاوار، شێخ محمودی قارەمان، ب١، ل٢٣٧. و.

کلیلی شوفرەوە ڕوونی بکەمەوە، هەر وەکو دواکەوتنی برووسکە بە هۆی ئەوەوە بـووە. تکایە ئاگاداریتان.

١ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣١٣(١٣ی کانوونی دووەمی ١٨٩٥)

سەرۆکی هۆزی جاف: مەحمود

## Irade Mesail-I Muhimme 1235

### خستنەڕو بۆ مەقامی باڵا:

ئەو کەسانەی ناردبوومـانن لـە دەوروبـەری شـار بـۆ لای پایەبـەرز لەسـەر داوای مەقامی باڵا گەڕانەوە و، پاشان فەرمانیان کرد بەبیرکردنەوە لەبابەتی چاکسازی لەوان، هەروەها پاڵپشتیکردن بۆ ناردنی سوپا بۆ قەڵاکـە، ئـەوانیش تـا چـل ڕۆژ وڵامەکـەیان دواخست، لە دواییدا پاشا کارەکەی بۆ هەموویان ڕوونکردەوە، (خوای گـەورە) دەزانـێ هەروەك خەڵکیش دەزانن، کەوا خەڵکی ئەم ناچەیە لە هەژاری و قاتوقڕیدا دەژین، بۆیە چاوپۆشیمان کـرد لـە نـاردنی چـەندین ڕاپـۆرت بـۆ لای مـەقامی بـاڵا لـەبارەی ئـەو مەسەلەیەوە، هیچ لایان نەداوە، چاودێریکردنی هەژاران و سۆزنواندن بەرامبـەریان لـەو تایبەتمەندیانەن کـە (خـوای گـەورە) بـە ئێـوەی بەخشـیووە و، ئێمـەی بـێ دەسـەڵات پێویستیمان بە سۆز و چاکەی گەورەمان سـوڵتان هەیـە، وەکـو بۆمـان دەرکـەوت کـە خەڵکی ئەم ناوچەیە ئێستا و نە لە داهاتووشدا هیچ خەراپەیەکیان لێوە سـەرهەڵنادات، ئەگەر ئەو چاکسازییانە لە ئەرزەروم و مووش و بایەزید جێبەجێ بکرێن، هەموو لایەك وای دەبینن، کـە سـوودێکی زۆری دەبێـت بـۆ چـاکردنی بـارودۆخی ژیـانی هـەژاران، ئەوکاتەش خەڵك هەمووی ناوی خۆی وەکو خۆبەخش تۆمار دەکات، چونکە دڵنیـان لـە کارەکە، بۆیە ئومێدەوارن بۆ ماوەیەك پشتگوێ بخرێن، ئەگەر فەرمان بکرێت بە ناردنی تابورێك یان دوو تابور لە سەرباز بۆ قەڵاکە، ئەوا سەردەکێشێت بۆ تـرس و دڵـەڕاوکێ، ئێستا قەڵای ناوبراو لەژێر چاودێریی تۆپەکانی ناوچەکەدایە و، ئێمە گرینگی دەدەین بە پاراستنی قەڵاکە بە گیان و جەستەمان، بۆیە داوا لە بەرێزتان دەکـەین بـە دواخسـتنی چاکسازییەکان و چاوپۆشی بکرێت لە ناردنی سوپای نیزامی بۆ قەڵاکە و، لەمەودوا کار

دەکەین بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و دارای پێویست بۆ خەزێنە بەپێی توانای خۆمان و، هەموو لایەك لەمە ئاگادار بکە، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمری چاکەکارە.
واژۆکان...

**Irade-Hususi**
**S.1323.١٦**
**کۆشکی یلدز هۆمایونی –سەرۆکایەتیی فەرمانگەی نووسین:**

بیرخەرەوەی تایبەتی بۆ مەقامی سەدارە بە مێژووی ٧ سەفەری ساڵی ١٣٢٣(نیسانی ١٩٠٥) بەرزکراوەتەوە لەسەر برووسکەیەك کە لە موسڵەوە هاتووە، کە بە هۆی شالاوی ئەوان بۆ سەر هۆزەکانی سلێمانی و کەرکووك و هێرشکردنە سەر هەمەوەندەکان بە ناوی تۆڵەسەندنەوە، پێویستە شێخ سەعید ئەفەندی سلێمانی و کوڕەکەی بۆ خانەی بەختەوەری (دار السعادە) و ژمارەیەك لە شێخەکان لە سلێمانی دوور بخرێنەوە، ئەوەی گومانی تیا نییە ڕووداوەکان بە هۆی گەندەڵی کارگێڕیی ئیداریی کاربەدەستانی مەحەللییەوەیە، گوێڕایەڵیی شێخ سەعید و ڕاستگۆیی داوامان لێ دەکات بایەخ بە زامنکردنی چاوەدێری و زیادکردنی خۆشەویستی خەڵکی و موسڵمانانی ناوچەکە بدرێ، ویستی ئیرادەی سوننی حەزرەتی خاوەن مەقامی خەلافەت هەندێك ڕاسپاردە بۆ ویلایەت دەردەکات بۆ دیاریکردنی ئەوانەی داواکراوە بگوێزرێن لە موتەسەڕیف و والی، فەرمان بۆ حەزرەتی خاوەن فەرمانە.

**١٩ی سەفەری ١٣٢٣(٢٤نیسانی ١٩٠٥)**
**سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتیی نووسین: تحسین**

**MV.84.35**

**دانیشتنێکی تایبەت بە کۆبونەوەکانی ئەنجوومەنی بریکارەکان (راسپێراو):**
**ڕێکەوتی ٢٤ی شەوالی ساڵی٣١٢ وە ٩ی نیسانی ساڵی ٣١٢:**

پوختە:ئەنجوومەنەکە لەڕێکەوتی ١٤ی شەوالی ساڵی٣١٢دا چاوی خشاندەوە بە وەبیرهێنانەوەکەی سەرۆکی سوپا، کە ئەو برووسکەی لە سوپای شەشەمی هۆمایونییەوە هات بۆ دەربڕینی سۆز لەسەر هەستکردنی سەرۆکایەتیی موسڵ بەوەی کەوا ولایەت گرینگی نادات بە کاری چاکەخوازی لە لای نەوەکانی کۆچکردوو شێخ کاکە ئەحمەدی سلێمانی و، لایەنگیریان لە ستەمکاران و خراپ هەڵسوکەتکردنی موفتی پێشوو وایکرد بە درێژای سنووری سلێمانیدا کە خەڵکێکی زۆر چەك هەڵبگرن، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ دەستتێوەردانی نەوەی خێڵە سوننییەکانی ئێران، کە سەرەنجامێکی سیاسی خراپی لێدەکەوێتەوە، ئەم برووسکەیە لەگەڵ ئەو برووسکەیە پەیوەستکرا کە لە ڕێکەوتی ٢٤ی ئازاری ٣١١ هات بە واژۆی سەید حەسەن و هەندێ سەیدەکانی بەرزنجە لە سلێمانی، کە هەندێ دانپێدانانی لەسەر بابەتەکە تێدابوو.

بڕیار:

ئەگەر هەوڵ بدرێت بە نێوبژیوانیی ناکۆکیی نێوان سەیدەکانی سلێمانی نەمێنێت، ئەوە خواستی ئاینی سوننی مەزهەب و خاوەن مەقامی خەلافەت دێتەدی، ئەوەی ئاگادارییە بەردەوامەکانی سلێمانی نەدەگەیشتە ویلایەتی موسڵ، هەندێ جار هەندێکیان گەیشتنە ویلایەتی موسل و ئاشت کرانەوە، بەڵام بەپێی قسەکانی فەرماندەی موسڵ کە باسمان کرد، هێشتا خەڵکێکی زۆر بەدرێژایی سنووری سلێمانی چەکیان هەڵگرتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هێشتا ناکۆکییەکە کۆتایی پێ نەهاتووە، برووسکەکانی سلێمانیش پشتگیری قسەکەمانن، بە هۆی بەردەوامبوونی ئەو ناکۆکیانە ئاساییبوونی نێوانیان ئەنجوومەن بە پێویستی دەزانێ ئاگاداری ویلایەتی موسڵ بکاتەوە و کاری تێ بکات، ڕێوشوێنی کارا لەو بارەیەوە بگرێتە بەر بۆ بنبڕکردنی ناکۆکی و ڕێگەگرتن لەکارەسات، کە جێی ڕەزامەندیی پایەبڵندانە.

واژۆکان

## YM tv 278/ 107 Left

**سەرۆکایەتیی سوپا/ بەشی قلم:**

وێنەیەك لەو نامە هاوبەشەی لــە لایــەن ســوپای شەشــەمی هۆمــایونی خرایــە ڕوو پێشکەش کرا، کە لە لایەن متصرفیە و سەرۆکایەتیی ســلێمانییەوە بــۆ ســەرۆکایەتیی فرقەی دوانزە نێردرابوو، دەربارەی شێخ کاکە سەعیدی ئەفەندی کە لە شــاری ســلێمانی نیشتەجێیە، هەروەها وێنەکەی دی بۆ بابی عالی نــارد و، فــەرمان بــۆ حــەزرەتی وەلی ئەمرە.

٢١ی ڕەجبی ساڵی ١٩٠٥/٣٢٣ز ٨ی ئەیلوولی ساڵی ٣٢١

سەرۆکی سوپا: ڕەزا

## Lef 3

**رووی یەکەمی لاپەڕە:**

شێخ سەعید، کوڕی کاك ئەحمەدی سلێمانی، سەرۆکی سەیدەکانی ئەو ناوچەیەیە، بە هۆی ئەو پەیوەستییە بیروباوەڕەی لە خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخەوە بۆی ماوەتەوە، خــۆی بــە سەرۆکی هۆزی جاف و هۆزەکانی دی دەزانێ، لەوکاتەی پێویســتی بــە هۆزەکــانی دەوروبــەری سلێمانی دەبێت پەنا دەباتە بەر حکوومەتی ســوننی و پڕووپاگەنــدە لــەنێو ئــەو هۆزانــە بــڵاو دەکاتەوە کە لەژێر گوێڕایەڵیی ئەودا نین، وەکو هــۆزی هەمەوەنــد و ئــەوانی دی، ســەیدەکانی سلێمانی و هۆزەکانی دەورووبەری و ئەو هۆزانەی ناومان بردن، ئەگەر چەکدار بکرێن هێزێکــی بایی هەڵگەڕانەوەیان لێ پێك دێت، هەموو فەرماندە و موتەسەڕیف و فەرمانبەرانی هاتوونەتە سلێمانی داواکاری ئەویان قبوڵ نەکردووە و بەناڕەواویان زانیوە، ئــەو کارانــە زیــان بەخەزێنــەی دەوڵەت دەگەیەنێ و تێك دەگیرێ لەگەڵ یاسا و سیستم و بنەماکان و بوختان و ساختەن و هیچ بنەمایەکیان نییە، دۆستانی و شەریکە بەشەکانی خۆی وا لێکردووە سامانی حکوومەت تــاڵان بکەن و دەست بەسەر موڵکی گشتیدا بگرن، دەتوانێ لەلای موقامی باڵا فێڵ بکات و هــەوڵی

لابردن و دوورخستنەوەی خەڵکی بدات، بەمەش وای کردووە هەموو لێی بترسن و ناچاریان بکات بەرەزامەندی ئەو بجوڵێنەوە.

لەراگەیاندنی حکوومەتی تازە دەتوانیٚ هەرچی مەبەستی بێت بەدەستی بهێنێت، بەڵکو لە حکوومەتی رابردووش حاکمی بیٚ رکابەر بووە، هەروەها شێخ توانیبووی سۆز و بەزەیی حەزرەتی مەلانا سولٚتان سێبەری (خوا) لەسەر زەوی و خەلیفە و مسولٚمانان و عوسمانییەکان بەتایبەتی بەدەست بهێنیٚ، مووچەیەکی مانگانەی بۆ ببرنەوە، بە نێزیکەی چل هەزار قروش، ئەمە سەرەرای سوودوەرگرتن لە پێگەکەی دۆستانی خۆی، کە بەکاربەدەستی دامەزراندوون، جگە لەوە بە ئەندازەی حەوت یان هەشت لەو مووچەیە داهاتیان لیٚ وەردەگریٚ و بەشێکی زۆر کەم نەبێت نایگەرێنێتەوە بۆ خەزێنە، هەروەها لەباجی مەر و ئیدارەی سەربازی و شتی دی بوێردراون لەگەڵ خەرجییە پێویستەکان، هەتا لەسەردەمی دەیەکیش وامامەڵەی لەگەڵ کراوە کە لیوای سلێمانی تووشی هەژاری و پێویستی بوو.

دووەم: کاتێك حکوومەت پەنا دەباتەبەر سەرکۆنەی ئەوانەی ناکۆکن لەنێوان خۆیاندا نابێت ئەو دەستی یارمەتی و دەسەلاٚتیان بۆ درێژ بکات، ئەو کات تاوانباران لە دەستی زەبت و دادگەری دەردەچن، ئەو سیاسیانە مامەڵە دەکات و بکوژان دەپارێزیٚ، ئینجا حکوومەت دەستەوستان دەوەستیٚ بەرانبەر بیرخەرەوە و هەزاران شاهید، ئەوکات سام و هەیبەتی حکوومەت نامێنیٚ و سام و هەیبەتی ئەو زیاد دەکات، لێرەدا شێخی ناوبراو سەردەکەویٚ لە باوەری خەڵکی لە تاوانبارکردن و بوختان بۆهەڵبەستن بە شایەدی بەدرۆ بۆ ئەو کاربەدەستە مەدەنی و سەربازیانە، ئەوانە بە رێگەی حکوومەتەوە سەرشۆر دەکەن و لەلایەکی ترەوە لە دەستی حکوومەت رزگاریان دەکات، هەتا ئەگەر گەورەترین شۆرشیان کردبێت، ئیتر وردە وردە پێوەندیی مەعنەوی خەڵکی پێوەی چەند هێندانە بەهێز دەبێت، هەتا خەڵکی رەش و رووت داننانێن بە گوێرایەڵی بۆ حکوومەت و لە ترسانیش وەکو کۆیلەیەك وان بۆ شێخ، شێخی ناوبراو لەکاتی دوورخستنەوەی هەمەوەندەکان هەندیٚ زەوی بیٚ تاپۆی لە حکوومەت کری بوو، کاتیٚ هەمەوەندەکان لەدەست بەسەری هەلاٚتن و گەرانەوە سەر زەوییەکانی خۆیان و دەستیان کردەوە بەکشتوکاڵ، بە هۆی ئەو زیانەی بەگەرانەوەی ئەوان پێی کەوت، بیری کردەوە و هەندیٚ بوختانی بۆ هەڵبەستن، هەر لەو ماوەیەدا زوڵمێکی تری لیٚ بەدیارکەوت، ئەویش کاتێك سەید نوری سەید حەسەنی کانی کەوالی کوژرا، ئەو مەبەستەکەی هاتەدی و خوێنەکەیان داوا دەکرد و کار

گەیشتە لای مەقامی حەزرەتی سولّتان، بە جدی مەفرەزەیەك سازدرا و کەوتنــە دووی گــرتنی زۆراب و هیدایەت لە تیرەی سەفەرەوەندی سەر بە هۆزی هەمەوەند، بــەلاّم ئــەو بەلّێنانــەی بــە شوێنکەوتووانی داوە کە سەر بە ڕەچەڵەکی سەیدانن، لە سایەی ئەودان لە لای خەڵکی سلێمانی ناسراون بە دزی و هەموو جۆرەکانی بەدڕەوشتی هەتا هەندێکیان بەسووك و ناتەواو ناسراون، لە هۆزەکانی جاف و ڕوغزایی هەولّی داوە بەسامان و دەسەلاّت و چەك و تەقەمەنی، بەپێدانی ئەو مالّە تالاّنییەی لەکاتی شەڕدا دەستیان کەوتووە توانیویەتی هەلّیان بخەلّەتێنن و نێزیکەی هەزار سوارە و پیادە کۆ بکەنەوە و بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمود بۆ گوندی داریکــەلی بینێــرن، کــە چوار تا پێنج سەعاتەڕێ لەسلێمانییەوە دوورە، هەروەها لەو گوندەوە دووسەد کەسی لەو هێزەی کە شێخ سەعیدی بەڕیوەبەری قەرەداغ کۆی کردبووەوە، یەکێك بووە لەخزمەکانیان و لە لیــوای سلێمانی بە زالّم ناسراوە، وا بەدیار دەکەوێ بۆ سوتاندنی گوندەکانیان سوورن لەسەر هێرشکردنە سەر هەمەوەن[(٨)] زوو پێوەندیمان بە موتەسەڕیفی سلێمانییەوە کــرد، بابەتەکــەمان خســتەڕوو و برووسکەیەکمان لەو بارەوە کرد، ئامادەیی وەرگیراو بەرەو ئەو داوایە پالّیان نا، بەلاّم ئامۆژگاریی ئەو مەفرەزە سەربازیەی لەچەمچەماڵەوە ڕەوانەی گوندی داریکەلی کرابوو، بــە ســەرۆکایەتیی بەگباشی، مستەفا ئەفەندی بۆ لای شێخ مەحمود ئەفەندی شایستەی وەرگرتن نەبوو، چونکە ئەو مەفرەزەیە نەیتوانیوە بەزەبری هێز کاری وا ئەنجام بدات، لەکاتی گەڕانەوەی ئەو مەفرەزەیە بــۆ چەمچەماڵ بە هۆی زیادبوونی ژمارە و ئــەو تۆپــەی لــەوێ بــووە لەگــەڵ ژمارەیــەکی کــەمی هەمەوەندان لەگوندی بەگەجانی تێکگیران و شێخ نەجمەدینی برای ســەید نــووری کــوژرا، کــە برایەکەشی پێشتر کوژرا بوو، بەگباشی، مستەفا ئەفەندی لەکاتی گەڕانــەوەی لــە چەمچــەماڵ لێکی جیاکردنەوە و پێکدادانەکەی وەستاند، کاتێ بینی شێخ سەعیدی سلێمانی بەو ئاگاداریانە وازناهێنێ و هێز کۆدەکاتەوە، ئەمیش ناچارە هێز بەکار بهێنێ، بە برووسکەی ڕۆژی ٧ی ئازاری سالّی ١٣٢١(١٩٠٣ز) کە ناردم بۆ دەروازەی بالاّ، ویلایەتی پایە بلّنــدم ئاگــادارکردەوە، ئەگــەر بیهێنییە ژێر باری گوێڕایەلّی چار نییە بێجگە لە بەکارهێنانی هێز، مەقامی سەدارەتی بــالاّش بە ناوەرۆکی ئەو برووســکەیە ئاگــادارە، ئەگــەر ئەمــە نــاگونجێ لەگــەڵ ڕەزامەنــدیی ئێــوە و

(٨) هەمەوەندیەکانیش وەك هەر هۆزێکی دی بەرەوام لە کێشە و ناکۆکیدا بوون لەگەڵ بنەماڵەی شێخان، بۆ زنیاری لەسەر پەیوەندیی نیوانیان بڕوانە: م.ر.هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان، ب١٩٨،١. و.

بەکارهێنانی چەك لە دەرەوەی دەسەڵات، من ویلایەتی پایە بڵندم ئاگادارکردەوە کە بەگباشـی، مستەفا بەگم لە چەمچەماڵ گەڕاندەوە، ئەمە گونجاو بووە لەگەڵ ڕەزامەنـدیی بـاڵا و ئێمـەش ڕینومایی حەکیمانەی ئەو هێزانەمان کرد کە پابەندن، ئەوە بـە باشـی بەرژەونـدی دێتـە دی و ئۆقرەیی و ئاسایش زامن دەکات.

لە لایەکیی ترەوە بە فەرمانی حەزرەتی مەولانا سولڵتان سێبەری (خـوا) لەسـەر زەوی، بـە ویستی سولڵتان لە لایەن سەرۆکایەتیی بەڕێوەبەری هومایونی لە ڕێکـەوتی ١٧ی ئایـاری ٣٢١ ئاگادارم کردەوە کە دەرفەت نەدرێ خوێنی موسڵمانان بڕێژێ لەگەڵ بڵاوکردنەوەی خێـرای ئـەو قەڵەبالغیە، شێخی ناوبراو لەوە ئاگادارە، بەزمانێکی گونجاو تێگەیەنراوە کە کارکردن بە ئەمـە نیشانەی دڵسۆزی و گوێڕایەڵییە، بەڵام ناوبراو بەپێچەوانەوە هێزەکانی بڵاوە پێ نەکردووە، بەڵکو لە هەوڵی زیادکردنی هێزی دیکەدا بوو لە هۆزەکانی پشدەر و شوان و شێخ بزێنی بەڵام (خـوا) دەستی نەدا، پێمان وابوو بەو هێزەی کۆی کردۆتەوە دەتوانێ بەسەر هەمەوەندا زاڵ بێـت یـان هەموویان بەچەکەوە بگرێ، لە دووەم ڕۆژی ئاگادارکردنەوەکەی کە ڕاستەوخۆ بە ویستی سولڵتان ئاگاداری درایە، بەڵام ئەم لە داریکەلیەوە هێرشی کردە سەر هەشت گونـدی هەمەوەنـد، وەکـو سورتکە، ئەڵڵایی، بازیان، سەروچاوە، تەکیە، کلاشکەران، جولومـەك، ئەحمـەدە ڕەش، وەکـو ئاژەڵ هەموو کشتوکاڵی ئەو گوندانەیان کوێرکردەوە و زیانی زۆریان لێدان، کاتێك ئەوانە ڕێگەی بازیانیان گرت هەمەوەند ناچار بوون لە گوندی پیربادی و موزەفەری نێزیك قەزای بازیان پەنابەرن بۆ ئەو هێزە سەربازیەی نێـو قـەزا، موتەسـەڕیفیەتی سـلێمانی و فەرمانـدەکانی لـە ڕێگـەی فەرماندەی بازیان میر ئالای تۆفیـق بـەگ لەسـەر ئامـادەیی بـۆ قبـوڵکردنی داواکارییـەکانی سەیدەکان و شێخی ناوبراومان ئاگادارکردەوە، بەڵام وەکو لە وڵامی پێشووتر ڕوون کراوەتەوە ئەو ڕازی نەبووە، بەوەندەش وازی نەهێنا بەڵکو لێکدانەوەی سەیر و سـەمەرەی بـۆ قەدەغـەکردنی سەربازی سولڵتانی کردووە و بەجۆرەها بوختـان و سـاختە کەسـایەتیی مـیر ئـەڵڵایی لەکـەدار کردووە، ئەو ڕۆژی بیست و پێنجی ئازار خۆی ئامادە دەکرد بۆ هێرشکردنە سەر چەمچـەماڵ، لەو کاتەدا نێزیکەی چل کەسی هەمەوەند بۆ بەرەنگاری سوارەکانی هۆزی ڕوغزایـی و گـەڵاڵی چووبوون، لەو شەڕەدا سەرۆکی ڕوغزائی کـوژرا و هەنـدێك برینـدار بـوون، ئەوانـە ناچـاربوون بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان و پاشان گەڕانەوە لای سەیدەکان، هێزەکە تەقەی چڕیان کردە سـەر هەمەوەند، بەڵام ئەو چەل هەمەوەندە بە هۆی کارامەیی لە شەڕ و باش ئاگاداربوونیان لە خاکی

ناوچەکەیان کە شوێن و زێدی خویانە بەرەو ڕووی ئەو هێرشە ناڕەوایــە بوونــەوە و هێرشــکاران پەرت و بڵاویان لێکرد، هەر لەو ماوەیەدا پاشماوەی هێزی هەمەوەند لە هەردوو گوندی پیربادی و موزەفەر کە ژمارەیان دووسەد و پەنجا کەس بووە، بەرەو شەرگەکە هاتن، کە بینیان ئەوانە دێن هەتا سەنگەری قایمیشیان پێ بەجێ هێشتن، لە ترسی ئەو هەمەوەندانە کە ژمارەیان لەسێ سەد کەس زیاتر نەدەبوو، گەڕانەوە بــۆ گونــدی داریکــەلی، هێــزی هەمەوەنــد بــە دوایانــەوە بــوو، هەندێکیان لەوێ و بەشەکەی تریان لە شوێنی خۆی کەوتنە شەڕ، تێکشکانی ئەوان لە لایەن ئەو هێزەی هەمەوەند کە بەکەمتر لە یەك لەسەر پێنج دادەنرێ، ئەمە بە هۆی بێ ڕێزیی شێخ سەعید ئەفەندی بووە لەوەی بەهای بۆ خواستی سوڵتان دانەناوە، بڵاوەی بــە هێزەکــەی نــەکردووە، بــە پێچەوانەی ڕەزامەندیی پایەبڵند جوڵاونەوەتەوە، بۆیــە تووشــی ئەمــە بــووە، بێگومــان ئەمــە کەرامەتی حەزرەتی مەولانەمان، سوڵتانە، کاتێك شێخی نــاوبراو جــاف و هــەموو هۆزەکــانی دیکەی لە سلێمانی لە بەرانبەر کۆشکەکەی خۆیدا بینی و ڕووی لە هەمەوەند وەرگێــڕا، گــوێی لەو هۆزانە بوو کە گلەییان لە چەك هەبووە، بەڵام ســەیدەکان بــۆ فریاکــەوتنی ئــەوان هیچــیان نەکرد، ناردنی بۆ شەڕ هەتا هیچیان پێ نەمێنێ، هەستی بە پەشیمانی کردووە، کە گــوێی بــە ویستی سوڵتان نەداوە، لە لایەکی ترەوە کەسایەتی و پایەی لای خەڵك نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕایگەیاندووە بەو هێزەی بەسەر هێزە هێرشبەرەکاندا ســەکەوتووە و ئــیرادەی ســوڵتانی بــەجێ هێناوە، بەڵام ئەو لوتی شکاوە و بەخراپی تێکشکاوە، کەچی هەر زوو دەستی بەدرۆ و ناڕاستی کردووە، داوای کردووە هێزی سەربازی بۆ بنێرن بــۆ پاراســتنی داچــێنراوەکانی داریکــەلی کــە ناوەندی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە هێرشبەرەکانی سەیدانە، کە بە پێی تاپۆ بوونەتە خاوەنی ئەوێ و گوندەکانی دەورووبەری، ئەمەش بۆ ئەوەی هەمەوەند نەیسوتێنن و خراپی نەکەن، فەرمانــدەی بازیان و قایمقامی ئەوێ بۆیان دەرکەوتووە هەمەوەند زات ناکەن تۆڵە لە شێخ بکەنــەوە، بــەڵام بەپێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتووە داوا لە حکوومەت دەکــەن نــەهێڵێ شــێخ زوڵمیــان لێ بکات، بەڵام فەرماندەی ئەو تیپە وەڵامی برووسکەی داونەتەوە کە ئەو جۆرە شاڵاوە ســەربازیانە مەترسی نییە و هێزی پاسەوانیی ناداتێ، کە داوایان کردبوو، لەگەڵ ئــەوەش شــێخ مــەحمودی کوڕی و شێخ سەعید و بەڕێوەبەری قەرەداغ لەگەڵ سەد کەسێك لــەو شــوێنە ماونەتــەوە، لــەو بارودۆخەی پێشتر باسمان کرد دەردەکەوێ پڕوپاگەندە لای بەڕێوەبەرایەتییە باڵاکان هەبووە، کــە شێخ بە هۆی هێزی شــێخایەتیی خۆیــەوە دەتــوانێ خــەڵك بــە شــێوەیەکی گشــتی لــە هــۆزە

جیاجیاکانی لیوای سلێمانی کۆبکاتەوە و چی بویٚ پێیان بکات، هەرکارێکی مەبەستی بێت بە دەستی بهێنێت، بوختان و تاوان دروست دەکات و کاربەدەستە سەربازی و مەدەنییەکان ناڕاستە ڕێنومایی دەکات، نموونەی وا زۆرە، بەگشتی ترس و بیمی لەنێو خەڵکی سلێمانی بڵاوکردۆتەوە، کە ناوێرن لە فەرمانی دەرچن، هەروەکو تێڕوانینی گەورەمان سولّتانە کە ئەمە لە ئەهلی گوێڕایەڵی و ساغبوونەوەیە و دەبێت پایە و گۆشەی شەریفی هەبێت، لێرەش دەتوانیٚ زیاتر زوڵم بکات و خواستە تایبەتییەکانی بەدەست بهێنێت، هاوکات پێچەوانەی ڕەزامەندیی پایەدار و یاسا تاوانی گەورەی ئەنجام داوە، وەکو چەکدارکردنی بەشێکی خەڵکەکە و بەگژابردنی ئەوانی دی، ئەوانە فێری کوشتن و سوتاندنی ماڵ و سامانی خەڵك و وێرانکردن و دزی و زەوتکردن دەکات، ئەمەش پێچەوانەی گوێڕایەڵیی گەورەمان خاوەن تاج و سولّتانە.

لە واقیعدا بە نارەحەتی و زۆرلێکردن نەبێت ئەو ناتوانیٚ هەزار پیاو کۆ بکاتەوە، لێرەوە بۆمان دەردەکەویٚ بە جۆریٚ لە کەس شاراوە نییە ئەو هێزەی نییە وەکو بانگەشەی بۆ دەکات، شەرمەزارە و تووشی تێکشکان بووە، پوختەی قسە ئەوەیە ئەو بارودۆخەی خستمانەڕوو زیان بە دارایی لیوای سلێمانی و توندوتۆڵکردنی دەگەیەنیٚ و ڕێگە لەخەڵك دەگریٚ، کە گوێڕایەڵیی حکوومەت نەکەن و قبوڵی فەرمانی لێپرسینەوەی ئەو بن، لەڕاستیدا ڕاستگۆیی و وەفاداری و گوێڕایەڵیمان بۆ حەزرەتی مەولانا سولّتان وامان لیٚ دەکات دڵنیا بین بەهەر شێوەیەك بێت دوورخستنەوەی شێخ و کوڕەکانی و خزمەکانی لە لیوای سلێمانی پێویستە[٩] فەرمانیش لای حەزرەتە و ئەو خاوەن فەرمانە.

٣٠ ئایاری ساڵی ١٣٢١(١٩٠٣ز) / لیوای٢٣

موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی ئەحمەد تۆفیق ساڵح سالم

(٩)دیارە ئەو ناوبانگ و پلەوپایەی شێخ سەعید هەیبوو، بەتایبەت دوای بانگهێشتکردنی لە لایەن سولّتانەوە بۆ ئەستنبول و پێدانی شفرەی نهێنی خۆی، نەیارەکانی ڕقی زۆریان لێداگرت بەتایبەت ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتحادوتەرەقی، بۆیە کەوتنە بوختان و درۆ بۆهەڵبەستن بۆی، تا دواجار بۆ موسڵ دوور خرایەوە هەر ئەوانەش بە بەرنامەیەکی دارێژراو ساڵیٚ (١٩٠٨) کوشتیان، بڕوانە: ڕەفیق حیلمی، یادداشت (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود)، چاپخانەی ڕۆشنبیریی لاوان، ١٩٨٨، بەشی یەکەم، ل٣٩؛ م.ر.هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل١٤٣ ئەوانی دی. و.

## ((بەڵگەنامەکان لەسەر عەبدولڕەحمان بەگی بەدرخان))

**R 1318 Irade-Hususi.٤٨**

**کۆشکی یلدزی هومایونی – سەرۆکایەتیی فەرمانگەی نووسین:**

کونسولخانەی سوننی (عوسمانی و.) لە لندن ڕایگەیاند کە عەبدولڕەحمان بەگی نەوەی بەدرخان پاشا لەوێ بەنیازن ڕۆژنامەیەك بە هەردوو زمانی (تورکی و کوردی ) دەربکەن، بەپێی ئەو زانیارییەی کە لە سەفارەتی ناوبراو پێمان گەیشتووە، دەربارەی بڕیاری دەوڵەت سەبارەت بەو کارمەندانەی کە شوێنی کارەکەیان بەجێهێشتووە، بەبێ هیچ هۆکارێك وەك وەرگرتنی لارینەبوون بەپێی ڕێنماییەکان و، لەکاتێکدا کە مۆما ئارەزووی لەم کارە نەبوو بەپێی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە دەگەڕێنرێتەوە بۆ کۆشکی سوڵتان و، شتێکی سروشتییە کە دەربکرێت لە کارەکەی یان دوور بخرێتەوە لە شوێنکەوتەیی عوسمانییەکان، کەواتە گرتنەبەری هەر ڕێوشوێنێکی پێویست لە لایەن سەرۆکایەتیی خەلیفەی سونییەوە دەبێت، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

١١ ی ڕبیعی دووەمساڵی ٣١٨ / ٢٥ تەمووزی ساڵی (١٩٠٠ز)

سەرۆکی فەرمانگەی نووسین

**DH MVI**
**T.7N.1327**

لەژێر کاریگەری ئەو برووسکەی کە لە ڕێکەوتی ٢٥ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥ (١٩٠٧ز)دا نوسراوێکی بۆ بەشی چاودێریی سەربازی نارد لە ٢٢ی هەمان مانگدا، بە مەبەستی دڵنیاکردنەوەی ولایەتەکە لەسەر نەبوونی توانای سەربازی پێویست و، ناردنی نووسینێکی دی بۆ هەمان چاودێری سەربازی، بە مەبەستی دەرکردنی فەرمانی کۆتایی بە ئاگادارکردنەی هێزی ناوبراو، بۆ ئامادەکردنی هێزێکی تەواو و پێویست بۆ

بەرەنگاربوونەوەی لە ڕێدەرچووان و زاڵبوون بەسەریاندا و، ناردنی وڵامـە برووسـکەیەك بۆ ولایەتەکە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ بەشی سەربازی بە مەبەسـتی خێراکردنـی چـالاکییە سەربازییەکە و دانانی سنوورێك بۆ دەستدرێژییەکان .

٢٤ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥

**((بەڵگەنامەکان لەسەر جووڵانەوەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی ))**

**DH MVI**

**٧٣ /٢-١**

**دەوڵەتی عللی عوسمانی – چاودێری پۆستە و گەیاندن (بروسکە)**

**ڕێکەوتی ٢٠ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥ (١٩٠٧ز)**

بۆ چاودێری ناوخۆیی:

ج/١٦ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥ چاومان خشاند بە وێنەی ئـەو برووسـکەیەی کـە لـە لایەن حسێن و هەندێك کەسی دی واژۆ کرابوو، لەسەر ئەو شێوەی کە نێرابوو لە لایـەن چاودێری بەڕێزەوە، قائمقامیەت پێشتر ئاگاداری کردنەوە بە هەستانی هەندێ لە یـاخی بووەکانی بارزان بە هێرشکردنە سەر قەزای ئاکرێ (عقرە) و دەوروبەری و، پێوەندی کرد لەگەڵ سەرکردەی سوپای هومایونی، ئەویش فەرمانی دا بـە نـاردنی مەفرەزەیـەك بـۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێزە، بەڵام کەمیی ئەو هێزە و پێوەندیی پێوەکردنی زۆرێك لـەو خێڵانەی کە لەسەر خراپە و ڕاوڕووت ڕاهاتبوون بە یاخیبووەکانـەوە، لەبـەر ئـەوە ئـەم هێزە داوای تۆپی چیایی (تۆپخانە) کرد و، ئێمە ئەوەمان لە وڵامی برووسکەیەکماندا لە ڕێکەوتی ٢٥ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥ ڕوون کردەوە و، ناردمان بۆ سەرکردایەتیی ناوبراو بۆ ئەوەی ئەو جـۆرە چـەکە پێویسـتانەمان بـۆ بنێرێـت و، ئامۆژگـاریی پێویسـتم بـە مەفرەزەکە دا بۆ تەمێکردنیان بە شێوەیەکی پێویست، بۆ ئاگاداریتان.

٢٠ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥

والی ڕشید

**فەرمانگەی ئەرکانی گشتیی جەنگی:**

**هۆبەی سێیەم:**

پوختە: لەربارەی تەمێکردنی بەرپرسان لەسەر بەردەوامبوونی دەستدرێژییەکانی شێخ بارزان و، پێویستی لەناوبردنی داواکراو سەعدی ئاغا کە لە کاتی ڕاکردنیدا لە لایەن شێخی بارزانەوە پارێزرابوو.

والی و سەرکردەی سوپای موسڵ ڕایانگەیاند کە شێخ بارزان دوای شکستی یەکەمی ڕایکرد بۆ لای مەسیحییەکانی تخوب و تەیاری لە لیوای هەکاری، بە هاوکاریی سەعدی ئاغا کە یەکێك بوو لە بەڕێوەبەرانی شارۆچکەی جال و ئاغا جالی سەر بە ولایەتیی وان، پاشان هێزەکانی خۆی کۆ کردەوە و دەستی کرد بە ئەنجامدانی ڕووداوە نەخوازراوەکەی بارزان و، شێخی بارزان دڵنیابوو لەوەی کە سەعد ئاغا دەیپارێزێت لەو نارەحاتیانەی کە تووشی دەبێت و، ئەو کەسانەی کە بوونە هۆی ڕووداوەکانی ئەم دواییە بۆ دیوانی جەنگ ئاشرا کران و، دەستیان کرد بە گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ دوورخستنەوەی سەعدی ئاغا لە شارۆچکەی جال و، پێشتر ئێمە سەرکردەی لەشکری هەشتی (وان)مان ئاگادار کردەوە بە پێویستیی هاوکاریی سەربازی بۆ ولایەتەکە و دەستگیرکردنی سەعدی ئاغا، بەڵام ولایەتی وان وڵامی داواکەی نەدایەوە، لە کۆتاییدا لە برووسکەیەکدا هات کە لەشکری هەشتەمی وان داوای دوو تابووری لە هێزی سەربازی کرد بۆ تەمێکردنی سەعدی ئاغا کە لە ناحیەی جال سەر بە قەزای جولەمێرگ نیشتەجێ بوو، لە پێناوی پاراستنی شێخی بارزاندا، سوپای چوارەمی هومایۆنی ڕایگەیاند کەوا لەشکری ناوبراو ڕاستەوخۆ وڵامی داواکەی دانەوە و تابووری پێویستی نارد بۆ تەمێکردنیان، بەڕاستی هەستان بەدەستگیرکردنی سەعدی ئاغا و ناردنی بۆ دیوانی جەنگ، کە لە لایەن ئەو کەسانەی دووجار دەستدرێژییان کردبووە سەر سەربازانی عوسمانی داڵدە درابوو و، ئاگادارکردنەوەی ئەوەی کە پێویستە بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست لە لایەنی مەدەنییەوە (ناسەربازی) وابەستەیە بە بڕیاری سەروومان، وێنەی هەموو برووسکەکانمان لەو بارەیەوە نارد، فەرمانیش بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٨ی زی الحجە، ساڵی ٣٢٧ و ٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٠٩ز)

چاودێری جەنگی

**DH MVI**

**١-٢/ ٧٣**

**دەوڵەتی بەرزی عوسمانی – چاودێری پۆستە و گەیاندن (برووسکە)**

**ڕێکەوتی ٢٠ی تەمووزی ساڵی ٣٢٥**

**بۆ سەرکردەی سوپا مەحمود شەوکەت پاشا:**

دەمەوێت بەڕێزتان ئاگادار بکەمەوە کەوا شێخ عەبدولسەلام بارزانی لە ناحیەی زێباری سەر بە قەزای ئاکرێی سەر بە ولایەتی موسڵ نیشتەجێ بوو و، بە هۆی کاریگەری ئەو زوڵم و زۆرییەی کە دژ بە خەڵکی ڕەش و ڕووت و هەژار ئەنجامی دابوو لە سەردەمی دەسەڵاتیدا، ناوبانگێکی خراپی دەرکردبوو، بۆیە کۆمەڵێك پیاوکوژی لە دەورە کۆبوونەوە و دەستی گرت بەسەر شارەکەماندا و خەڵکەکەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و، هەر لە کاتی ڕاگەیاندنی حوکمی دەستوورییەوە هەڵدەستا بە گەمارۆدانی گوندەکانی دەوروبەر و ئەنجامدانی کاری کوشتن و دزی و ڕاوڕوت و هەتککردنی ئابڕۆی خەڵك، پاشان پەنایان دەبردە بەر زۆریهێنان بۆ شارەکە.

**DHMVI**

**١-٩/١٥**

**چاودێری ناوخۆیی- فەرمانگەی هەواڵگریی گشتی**

**بۆ چاودێری جەنگی بەڕێز:**

بۆ ئاگاداریی بەڕێزتان، بە پێی برووسکەی ژمارە (٤٤٥٨) لە ڕێکەوتی ٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥(١٩٠٧ز) گەمارۆدانی هەردوو ویلایەتی موسڵ و وان تەواو بوو، ئەمە بە فەرماندەی سوپای چوارەم گەیەنرا، بە مەبەستی جووڵاندنی تابوری پێویست و ناردنیان لە سوپای چوارەمەوە بۆ ناوچەی جال و جولەمێرگ، بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی شێخی بارزان و هاوکارەکانی، سەرباری ڕووبەڕووبوونەوەی هەندێ کێشە و گیروگرفت بە هۆی بارودۆخی ناوچەکە و کەوتنەوەی زەرەر و زیانی زۆر لە خەڵك، بۆیە وا باشتر بوو کە هەڵمەتە سەربازییەکان بۆ ماوەیەکی کاتی ڕابگیرێن،

بەگشتی لە سەرەتای مانگی ئازاردا دەست پێبکەنەوە و، بەپێی برووسکەیەك کە لە ویلایەتی موسڵەوە هات کە تیایدا ئەوە هاتبوو کە شێخ و هاوکارەکانی کە ژمارەیان نێزیکەی سەد کەس دەبوو لە دووریی هەشت کاتژمێر لە چیای بارزانەوە لە سێ گوندا نیشتەجێ بوون، بۆیە ڕیشەکێشکردن و لەناوبردنیان لەسەر گەیشتنی تابوورەکەی سوپای چوار بۆ ناوچەی جال وەستابوو، پێویستە ئامادەباشیی تەواو بکرێت بە مەبەستی جوولاندنی تابوری ناوبراو، ئەم کارەش بە چاودێریی وردی سەربازییەوە پەیوەستە.

فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە

## فەرمانگەی ئەرکانی گشتیی جەنگی

### هۆبەی سێیەم

وێنەی ئەو برووسکەی کە لە ڕێکەوتی (١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥) لە لایەن فەرمانگەی ناوبراوە بۆ سوپای همایۆنی چوارەم لە ئەرزنجان نێردراوە:

کارە سەربازییەکان لە موسڵ و دەروبەریدا دەتوانرێت لە هەموو کاتێك لە کاتەکانی ساڵدا ئەنجام بدرێت، لەم لایەنەوە بە پێی تێڕوانین و بۆچوونی من ناتوانین ڕووداوە سەربازییەکان بە پێی ئەم ناوچانە بەراورد بکەین، بەڵام گوێنەدان بە کەش و هەوای و هەڵاتنی شێخ بارزان و هەڵنەستانی سوپا بە ناردنی هێز لە هۆکارە تایبەتییەکانە و، بۆ سووربوون لە سەر ئەو کارە سەربازییە ناچار بووین تابورێك بۆ ناوچەی جال بجولێنین و، هەموو فەرمانێکیشم بە سوپای هەشتەم دا، ئائەوەش وەڵامی ئەو برووسکەیەیە لە سەر ئەوەی، هەڵمەتی سەربازی لەم کاتەدا گونجاوە، بەڵام هێشتنەوەی تابورێك لە چیابەرزەکان (شوێنە سەختەکان) بۆ چەندین مانگ کارێکی گرانە و بە دەستهێنانی ئەنجامێکی باش لەبەرامبەر ئەو خۆبەختکردنە دوو کاری چاوەڕووانەکراون، بەتایبەتی کاتێك ناوبراو ناچار بوو پارێزگاری لە (ئاغاجال) بکات کە خەڵکی ناوچەکەی زۆر خۆشە دەویست، کە سەر بە مەڵبەندی (وان) بوو، بەڵام کاتێك بینیمان والیی موسڵ لە گەڵ ئەوەدا نەبوو کارەکە بە ڕێگەی ئاشتی چارەسەر بکرێت، بۆیە ئەم کارە پێویستی بە تێڕوانین و سەرنج هەبوو لەسەر ئەوەی کە پێمان ڕاگەیاندن، چاوەڕوانی ئاگاداریتانین بە پێی پێویستیی بارودۆخ.

((وێنەیەك))

**ج١٣ کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥(١٩٠٧ز):**

پێشتر لە شفرەی ڕێکەوتی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥دا ڕوونم کردەوە، کە ئەو ناخۆشیانەی ڕووبەڕووی تابور دەبنەوە لە مانگە سەختەکانی زستاندا لە وانەوە بۆ ناوچەی جال لە قەزای جولەمێرگ، لەو کاتەدا بە شێوەیەکی گشتی زۆر شتی تێدا لەکار دەکەوێت، وەك بازاڕ و جووڵە سەربازییەکان، ناتوانین ئەم بارودۆخە بە ئاو و هەوای گەرمی موسڵ بەراورد بکەین، بەڵام چاودێری سەربازیی موسڵ فەرمانی کۆتایی دەرکرد لەسەر هەستکردنی فەرماندەی ناوبراو بەوەی دەتوانێت هەڵسێت بەو هەڵمەتە سەربازییە و گرینگیەکەی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە من وەك کەسێکی سەربازی هیچ شتێکم لەبەر دەمدا نەماوە جگە لە گوێڕایەڵی و جێبەجێکردنی فەرمانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بەربەست و ڕێگر هەبوو.

هیچ چارەیەك نەبوو جگە لە جووڵاندنی تابورەکە و تێوەگلاندنی لەو بارودۆخە گرانە، لەسەر ئەم بارودۆخە فەرماندەی موسڵ فەرمانێکی بەپەلەی دەرکرد بە جووڵاندنی تابوری چوارەمی سەر بە کەتیبەی سی بە سەرکردایەتیی (راشد ئەفەندی)، بەوەی کە گونجاوترین و ئامادەباشترین تابورە کە لە ماوەی دوو تا سێ ڕۆژدا دەجووڵێت، نەمتوانی هیچ شتێك دەربارەی ئەو فەرمانە بکەم، جگە لە ڕوونکردنەوەی ئەو ناڕەحەتییە و حاڵەتە لە ناکاوەی کە ڕووبەڕووی فیرقەکە بووەوە، بە ناردنی یەکێك لە تابورەکانی بۆ ئەو شوێنەی کە لێی گەڕابوونەوە بەبێ ئەوەی پشوویەك بدەن، ئەوەی ئاشکرایە لای بەڕێزتان هەموو قوربانیدانێکی سەربازی پێویستە لە گەڵ ئەو ئەنجامەی کە بەدەستی دەهێنێت گونجاو بێت، ئەگەر ئەم هەواڵگریانەی وەربگرین کە لە گەڵ ویلایەتیی واندا هەبوو بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم دەستپێشخەری و ڕێوشوێنانەی فەرماندەی موسڵ لە گەڵ ئەو خاڵەدا نەگونجاوە، چونکە فەرماندەی ناوبراو پەیمانی بە خۆی دابوو کە شێخی بارزان بە زەبری هێز لە ڕەگ و ڕیشەوە دەربهێنێت و، ویستی ڕێگا لەبەردەم شێخدا دابخات کاتێك زانی بەرەو ناحیەی جال دەچێت، ئەوەش پێویستی بەوە دەکرد کە بوارەکان لە شاخ و شوێنە بەرزەکاندا لە دووریی پازدە قۆناغ لە (وان)ەوە دابڕێت، لە گەڵ تەمێکردنی ئاغا جال بە ئەگەری هەبوونی هێزی سەربازی و تێکدانی

بارودۆخی ناوچەکە بەبێ هۆکار، لە کاتێکدا خەڵکی جال هاتن بۆ دەزگای دەوڵەت (ناوەندی حکوومەت) پەیمانیان بە گوێڕایەڵیکردنی هەموو فەرمانەکانی دەوڵەت دا و، بەڵێنی ئەوەیان دا لە کاتێکدا شێخی بارزان هاتە ناوچەکەیان دەستگیری بکەن و ڕادەستی دەوڵەتی بکەن.

لە لایەکی دیکەوە شێخی ناوبراو هەواڵی نارد و ئارەزووی خۆی نیشان دا لەسەر خۆبەدەستەوەدانی بە مەرجێ لە لایەن حکوومەتەوە پارێزراو بێت، بەڵام فەرماندەی موسڵ پێشنیاری بۆ چاودێری ناوخۆیی کرد کە ئەو داوایەی لێ وەرنەگیرێت و، لەو برووسکەی کە دوێنێ لە لایەن سید عەبدولقادر ئەفەندی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە بۆ ویلایەتیی وان هات کە ئەو کاتە بە مۆڵەت لە شەمزینان بوو، شێخی بارزان نامەیەکی بە واژۆی خۆی بۆ نارد کە تێیدا ئامادەیی دەرخستبوو لەسەر لارینەبوونی بە جێبەجێکردنی داواکاری و مەرجەکانی دەوڵەت لە بەرامبەر پاراستنیدا، لەگەڵ ئەوەدا والی و فەرماندەکانی موسڵ (فازڵ پاشا) سووربوون لەسەر نەپاراستنی، لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بارودۆخانەدا ئێمە هیچ بڕوبیانوویەکی ژیرانە (لۆژیکی) نابینینەوە بە ناردنی سەرباز لە وانەوە بۆ ناوچەی جال لە جولەمێرگ لە لایەن فەرماندەی موسڵەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تابوری ناوبراو لەسەر فەرمانی بەڕێزتانە و ئامادەیە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەرباز بنێرێت، ئێمە وەفاداری دەوڵەتین لە هەموو کاتێکدا، بۆ ئاگاداریتان.

**چاودێری ناوخۆیی – فەرمانگەی هەواڵگریی گشتی**
**بەروار ٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣٢٥**
**بۆ چاودێری سەربازیی بەڕێز:**

وەڵامی یاداشتنامەی بەڕێزتان ژمارە (٤٤١٩)ی ڕێکەوتی ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥، ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە کە شێخی بارزان مەیلی هەڵگەڕانەوەی دژی حکوومەت نییە، بەڵام سەرکێش و خراپەکارەکانی ئاکرێ هانی دەدەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەربازی و، ویلایەتی وان و عەبدولقادر ئەفەندی ئەندامی

ئەنجوومەنی نوێنەران لە برووسکەیەکدا ڕوونیان کردەوە بۆ چاودێریی بەڕێزتان کە وا شێخی ناوبراو ئامادەیە بۆ خۆبەدەستەوەدان و ئامادەیە داوای پاراستن بکات، بە مەرجێك دەوڵەت بە دڵنیاییەوە مافی پاراستنی پێ بدات و، ناوبراو شوێنەکەوتوانی لەو هێلە لایان نەدابوو کە دەوڵەت دیاری کردبوو و، ئەوان ئامادیی ئەوەیان هەبوو کە چەکەکانیان ڕادەست بکەن و بە هۆی بوونی کەسانێك لە ناویاندا داوای پاراستن دەکەن، بەڵام قبوڵکردنی داواکاری لەمجۆرە لەو کەسانەی کە بە کاری خراپەکاری هەڵدەستن و هانی کەسانی تریش دەدەن لە سەر ئەنجامدانی هەمان هەڵسوکەوت، بەڕاستی قبوڵکردنی ئەم جۆرە داواکارییانە ئەنجامی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا پێویستە لە زووترین کاتدا کۆتایی بەم کێشەیە بهێنرێت و، دابینکرنی ئارامی و ئاسایش لەو ناوچانەدا گرینگە، نووسراوەکە تەواو بوو، بۆ فازڵ پاشا والی موسڵ نێردرا، بۆ ئەوەی پێوەندی بە فەرماندەی ویلایەتی (وان)ەوە بکات، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئەو هێزانەی کە لەوێن بەسن بۆ کاری خراپەکاری و ئاژاوەگێڕی، بۆ خێراکردنی کارەکە و ڕیشکێشکردنی ناوبراوان لە نێزیکترین کاتدا و، ئەگەر بارودۆخەکە بە پێچەوانەی ئەمەوە بوو داواکانیان وەرگرین و دەیانپارێزین و سنوورێك بۆ زیادەڕۆییەکانیان دادەنێین و دەبێت هەڵسوکەوتیشیان بە پێی گونجاوی بارودۆخەکە بێت، ئەوەی خاوەن پایەی ویلایەت پێی گەیشت لە پێویستیی دەستگیرکردنی سەعدی ئاغای سەرۆك خێڵ کە لە ناوچەی جالی و سەر بە قەزای جولە مێرگ نیشتەجێ بوو، ئەمەش هەڵاتنی شێخی ناوبراوی ئاسانتر کرد و، بووە هۆکارێك بۆ دروستبوونی هۆکارە دڵتەزێنەکەی ئەم دواییە.

لە یاداشتنامەیەکی گرینگدا ئەم بارودۆخە ڕاگەیەنرا و سەعدی ئاغایان بۆ مەڵبەندی قەزای جولە مێرگ هێنرا، بەڵام لەبەر تەقەمەنی و نالەباریی کەش و هەوا داوای کرد کە لە مەڵبەندی قەزای جولە مێرگ بمێنێتەوە و بۆ مەڵبەندی ولایەت نەنێرێت، تا کاتی بوونەوەی ڕێگا و، ئەو هیچ ڕێگرییەکی نەبوو لەوەی کە لە مەڵبەندی قەزا بمێنێتەوە .

**فەرمانگەی ئەرکانی گشتیی جەنگی**

**هۆبەی سێیەم:**

ئەو برووسکە نهێنییەی کە لە ڕێکەوتی ٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥ لە (فـازڵ پاشا)ی والی و فەرماندەی موسڵ و دەوروبەرییەوە هاتووە:

ج٣٠ تشرینی دووەمـی سـاڵی ٣٢٥ بـەو شـێوەیەی کـە لـە سـەرەتا و کۆتاییـدا خستمانە ڕوو، لە دوای شکستی شێخی بارزان و هاوکارەکانی، پرۆسـەی ڕاوەدوونـان و پێکدادانی سەربازی لە ناوچە شاخاوییەکان بە شـەو و ڕۆژ بـۆ مـاوەی نێزیکـەی یـەك مـانگ بەردەوامـە و، لـە چـەند پێکدادانێکـدا لـەو سـەرکردە یاخیانـەی وەك فـەقێ عەبدولڕەحمان حاجیك و صارم علو فارس و یونس کوژراون و، حەسەن بەگ بە برینـداری دەستگیر کرا، بەشێکی زۆر لە دارودەستەکانیان کوژران و سـەد کەسـیان لێ دەسـتگیر کرا، لە کۆتاییدا شێخی ناوبراو بە هاوکاریی سەعدی ئاغـا کـە دەسـەڵاتداری ناوچـەی جالە لە ویلایەتیی وان، توانی ڕا بکات بۆ نێـو مسـیحییەکانی تـەمووز و تـەیاری لـە لیوای هەکاری، ئێستا ناوبراو لە گوندی زاویتە خۆی بزرکردووە، هەرچـی هاوکارەکـانی وەك ( میجو و جیجو و خالید و مەلاحەسن و فەقێ خالید...) هاتوونەتە لای سـەعدی ئاغایان.

لە گەڵ ئەوەدا کە ئێمە چەند جارێك داوامان لە ئاغای ناوبراو کـردووە بـە گـرتن و ڕادەستکردنیان، بەڵام نکۆڵیی لە هەبوونیان لەو شوێنەدا کردووە، بە مەبەستی پاراسـتن و پارێزگاری لە سەعدی ئاغا نووسراوێکمان بۆ والیی وان و موتەسەریفی هەکاری نارد، هەتا هۆکاری خۆشاردنەوەی ئەوان و پێویستیی دەستگیرکردنیان ڕوون بکاتەوە، ئینجـا دەستەیەکی ئەسپسواریشمان بە سەرکردایەتیی (بکباشی الـترك صـالح بـگ) نـارد تـا کۆتایی قەزای عمادییەی سنووری ویلایەتەکە و، لە ئەنجامی ئەو بەدواداچوونەدا تـوانرا سێ لەو لەڕێدەرچووانە دەستگیر بکرێن و بیانگوازنەوە بۆ موسڵ، بە هۆی نەبوونی هیچ کاریگەرییەکی خراپی لەڕێدەرچووەکان لە نێو ویلایەتەکـە و، بـۆ ئاگـاداری لێیـان لـە چوونیان بۆ نێو مەسیحییەکانی تەیاری، نووسراوێك بۆ ویلایەتیی وان کرا، بە مەبەستی پێویستی دەستگیرکردنیان لە لایەن دەسەڵاتی ئەو ویلایەتانەوە، لە دواییدا بڕیارمـان دا بە گێڕانەوەی هەموو ئەو خەڵکانەی کە شوێن شێخی ناوبراو کەوتبوون، وەکـو ترسـێك

لێی، پاشان داوایەکمان پێشکەش بە دەوڵەت کرد و سەربارەت بە گێڕانەوەیان بــۆ ســەر ماڵ و جێگەی خۆیان، ئێستا ئێمە ئیدارەیان دەکــەین و، هــەتا لــە بــارزان و لیواکــەدا بــەرگری ســەرهەڵنەداتەوە و بــۆ پارێزگــاری لەناوچــەکە پێگەیــەکی سەربازیشــمان بــە ئەندازەی دوو تابور لە هێزی یــەدەك لــەوێ دانــاوە، لــە گــەڵ یەکەیــەکی نیزامــی لــە مەڵبەندی شارۆچکەی شیروان دوایی بۆ کاری پێویست بۆ موسڵ گەڕاندمانەوە، هەر کە بیستمان شێخ بۆ هەکاری گەڕاوەتەوە، دەستبەجێ فەرمانمان بۆ فەرماندەی بارزان دەکرد بە مەبەستی دەستگیرکردنی، بەڵام بە هۆی ڕوودانی هەڵەیەك کارەکــە ســەری نــەگرت، لەسەر ئەو بارودۆخەی ئێستا خستوومەتەڕوو، هیچ کەموکوورییەك لە ئێمەوە نــەبووە، بەڵکو ڕووداوەکانی ئەم دواییە ئەنجامی ترســنۆکی و نــەبوونی گوێڕایــەڵیی ئەنــدامانی هێزە یەدەگەکان و هەندێ لە ئەفسەرەکان بوو، ئەوانیشم بــۆ دیــوانی جــەنگ نــارد تــا سزایان بەسەردا بسەپێنرێت، بەڵام بە هۆی چوونیان بۆ لای سەعدی ئاغــا نــەتوانرا ئــەم تاوانبارانە دەستگیر بکرێن، ئەگەر هێزێکی سەربازی لەوێ دانــەنرێت و ســەعدی ئاغــا دوور نەخرێتەوە و سزا نەدرێت ئەوا هەڵمەتــە ســەربازییەکان ئــەنجامیان نابێــت، بۆیــە پێویستە دەستپێشخەری بکرێت بۆ ناردنی هێزی پێویســت و دۆزینــەوەی ڕێگایــەك بــۆ دوورخستنەوەی سەعدی ئاغا لە ناوچەی جال.

تکایە بۆ ئاگاداریتان.

**چاودێری ناوخۆیی – فەرمانگەی هەواڵگریی گشتی –**
**ڕێکەوتی ٢٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥**

**بۆ ویلایەتی موسڵ ژمارەی نهێنی:**

پاشــکۆ/ ٢٢ی کــانوونی یەکــەمی ســاڵی ٣٢٥ ویلایــەتی وان ڕایگەیانــد، کــە بەڕێوەبەری جال سەعدی ئاغای هێنایەوە بۆ مەڵبەندی قەزای جولەمێرگ، بە هۆی پیری و کەش و هەوا ناوچەکە داوای کرد کە لە مەڵبەندی قــەزای جولــەمێرگ بمێنێتــەوە تــا نەگەڕێتەوە بــۆ لای خێڵەکــەی و، دوایــی ڕوو دەکاتــە مەڵبەنــدی ویلایــەت لــە کــاتی دووبارەکردنەوەی ڕێگاکە و، ئەو هیچ لاری نییە لە مانەوەی ناوبراو لە مەڵبەندی قــەزا و، هەموو مەرجێکی پێویست لەو شوێنانەدا بۆ جووڵە سەربازییەکان هەبوو و، شتێکی

سادە بوو ناردنی هێز بۆ ناوچەکانی جال و جولەمێرگ، بۆ ئەنجامدانی کاری تــەمێکردن و سەرکوتکردنی پێویست و، ئەوەی ویلایەت ختیە ڕوو لە گەڵ بەرژەوەنــدیی گشــتیدا بوو، ولایەتی ناوبراو هەموو ڕێوشــوێنێکی گونجــاوی گرتۆتەبــەر بــۆ ئەنجامــدانی هــەر کارێکی پێویست.

**بۆ ویلایەتی وان ژمارەی نهێنی:**

ج٢٣ کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥ ئەوەی کە ڕاتانگەیاند دەربارەی سەعدی ئاغــای بەڕێوەبەری جال لە گــەڵ بەرژەوەنــدیی گشــتیدا بــوو، بــە هــۆی دەورەدان و ئابلۆقــەی ویلایەتی موسڵ داوا لە بەڕێزتان دەکەم کە لە گەڵ ویلایەتی ئاماژەپێکراودا ئاگادار بن بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست.

## ( بەڵگەنامەکان لەسەر سمکۆ)

**DH. KMS.3/35**

**چاودێری ناوخۆیی**

**١٣ شوباتی ٣٢٩(١٩١٠ز)**

**بۆ مەقامی سەدارەتی گەورە:**

پاشکۆی یاداشتانامەکەمان ژمارە (...) ( ژمارەکە نەنووســراوە و.) لــە ڕێکــەوتی ٥ی شوباتی ساڵی ٣٢٩، وێنەی ئەو برووسکە پێچراوەی کە لە ویلایەتی وانەوە هاتووە بۆتان دەخەینە ڕوو، کە تێدا ئــەوە ڕوون کراوەتــەوە (شــاویس یحیــی) کــە یەکێکــە لــە ئەندامانی یەکەی سنووری (١٩) بریندارە، لە کاتی گواستنەوەیدا بە هــۆی کاریگــەری برینەکەیەوە گیانی لە دەست داوە و، لاشەکەی لە لایەن شەش سەربازی ڕووسییەوە بــۆ (سەڵماس) گواستراوەتەوە و، لە ئەنجامی پێوەندیکردنی دەوڵەت دەربــارەی ئــەم بابەتــە ڕووسەکان سمکۆیان بۆ تەبریز گواستۆتەوە، بــەڵام بــە دڵنیاییــەوە لەســەرەتای بــەهاردا

دەینێرن بۆ سنوور، بۆ ئەوەی لەسەر پەلاماردانەکانی بەردەوام بێت، ئەوەی لەم بارەیەوە پێویستە ئەنجام بدرێت پێوەندیکردنی سیاسییەدەربارەی هۆکاری مردنی ئەو شاویسە و، ڕاگەیاندنی ئەنجامەکەی بە فەرمانی بەڕێزتانەوە وابەستەیە.

## DH.KMS. 3/35

## بابی عالی – فەرمانگەی ڕۆیشتوو (صادره)

**بۆ چاودێری ناوخۆیی بەڕێز:**

وەڵامی یاداشتانەکەتان ژمارە ( ١٩٧٢ و ٢٠١٠) لە ڕێکەوتی ١ و ٥ی شوباتی ساڵی ٣٢٩، لەسەر کاریگەریی هەستکردنی چاودێری ناوخۆی بەڕێز بە ئازادکردنی بە پەلەی (یوزباشیی عەبدوڵا ئەفەندی) سەرکردەی بەشی نۆزدەی سنووری (بیاجرکە)وە ئەوانەی لە گەڵیدابوون، کە ڕووبەری دەستدرێژییەکانی کۆمەڵێك شەقاوە بە سەرکردایەتیی سمکۆ بوونەوە و، هەستان بە سزادانی ئەو دەستدرێژیکەرانە و گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ دووبارەنەبوونەوەی ئەم جۆرە کارانە و، لە ئەنجامی ئەو ئاگادارکردنەوەیە چاودێری دەرەکی بەڕێز هەستا بە ناردنی یاداشتنامەیەك کە تیایدا سەفارەتی سوننی لە تاران (واتە سەفارەتی عوسمانی لە تاران... و.) ئاگادار کردۆتەوە کە کاری پێویست بکەن لەمبارەیەوە و، لە داهاتووشدا ئەوان جەخت لە سەر کردنی کارەکە دەکەنەوە و، چاوەڕوانی ئەنجامی ئەو پێوەندیکردنەی کە پێویستە لەسەر سەفارەتی ناوبراوەوە بکرێت و، هیچ پێویست نییە کە ئێستا ئەوەی داواتان کردووە لە سەفارەتی عوسمانی لە ڕووسیا، وێنەی وەڵامی یاداشتنامەکەمان نارد بۆ وەزارەتی دەرەوە، ئەم نامەیەش بۆ ڕوونکردنەوەی بارودۆخەکەیە.

٩ی ڕبیعی دووەمی ساڵی٣٣٢ و٢٢ی شوباتی ٣٢٩

لە سەرۆك وەزیرانەوە(**صدري الأعظم**).

## DH.KMS. 3/35
## بابی عالی – فەرمانگەی ڕۆیشتوو
## وێنەی یاداشتنامەی چاودێری دەرەکی:
## ژمارە (٤٣٣٨٧/١٢٥٠)

شەرەفمەند بووین بە بینینی یاداشتنامەکانی بەڕێزتان بە ژمارەکانی( ١٢٢٧ و ١٢٣٨) لە ڕێکەوتی (٢ و ٨ی شەوالی ساڵی ١٩١١/٣٢٩ز) وێنەی یاداشتنامەکانی چاودێری ناوخۆیی دەربارەی ئەو هەڵسوکەوتە خراپ و قێزەون و سووکایەتی پێکردنانەی کەبە (یوزباشی عەبدوڵا) فەرماندەی بەشی سنووری نۆزدەی (یاجرکە) و مولازم (اسماعیل و صیدلی شەوکەت) وە شاوێشێك و چوار کەسی تریان لە گەڵدابوون کرا، لە کاتی گەڕانەوەیان لە خاڵی ئێشکگریی گوندی (بانی)دا، لە لایەن هەندێ لە شەقاوەکانی (عبدوی[10]کە سمکۆ سەرکردایەتی دەکردن پشکنران و ئەو سوکایەتییەیان پێکرا و، دوایی گواسترانەوە بۆ سنووری بەشی ئێران، ئەوەی پێوەندیدار بوو بە چاودێریی جەنگی بەڕێز سەبارەت بەم ڕووداوە ئەنجامی بدات، ناردنی برووسکەیەك بوو بۆ سەفارەتی سوننی (عوسمانی و.) لە تاران کە داوا لە دەوڵەتی ئێران بکات سەرکۆنەی ئەم کارە بکات و سەرپێچیکاران و دەستدرێژیکاران سزا بدات و، ڕێ لە دووبارەبوونەوەی ئەم جۆرە کارانە بگرێت لە داهاتوودا، لە گەڵ پارێزگاریکردن لە هەموو خاوەن مافێك لە کاتی لێکۆڵینەوەدا.

لە وەڵامی برووسکەیەکدا هات، کەوا یوزباشیی ناوبراو ئەوانەی کە لە گەڵیدابوون ئازاد کران و سەفارەتیش داوای دەستگیرکردنی سەرپێچیکاران و سزادانیانی دەرکرد، وردەکاریی پێویست بە پۆستدا نێردرا و چاودێری ئاماژە پێکراوی تێدا ئاگادار کردەوە، لەو کاتەشدا یاداشتنامەیەك لە چاودێری ناوبراوەوە بە ژمارە(٢١٧٥) لە ڕێکەوتی (٣ی

---

(١٠) عبدوی:بەوتایفە دەوترا کە سمکۆ سەرکردایەتی دەکردن و لە ١٣ تیرە پێکهاتبوو، هەر سەرۆکی ئەم تایفەیەش سەرۆکی خێڵی هەموو شوکاك بوو، کە بنەماڵەی سمکۆ بوو، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ر.هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاك) و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێك، سوید، ١٩٩٥، ل٢١٥“ نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد وعەجەم (مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئێران)، چاپخانەی ڕوون، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤١٣. و.

شوباتی ساڵی ٣٢٩ )ەوە هات، کەوا یوزباشی عەبدوڵا لە گەڵ سەربازێك بە ناوی (حەسەن) بۆ بنکەی بەشی باجرکە گەڕێنرانەوە و، بە پێی ئەو زانیارییانەی کە دەزگای (کۆمپیری) بەشی یەکەمی سنووری ئێرانەوە ڕاگەیەنراوە (شاویش یحیی) دوای چاکبوونەوەی برینەکانی دەگەڕێتەوە، هەستان بە سزادانی ئەوانەی بوونە هۆکاری ڕوودانی ئەم بارودۆخە و دەستنیشانکردنی لیژنەیەك بۆ دیاریکردنی سنوور و دانانی نیشانەی بەرد لەسەر سنوور بە پێی ئەوەی کە لە پڕۆتۆکۆلەکەدا هاتووە و هەردوولا پەسەندیان کردووە.

بۆ تەواوکردنی هۆکارەکانی پارێزگاری لە سەر ئەم بارودۆخە، نووسراوێکمان دووبارە بۆ سەفارەت نارد و جەختی لەسەر کرایەوە، دوای هاتنی یاداشتنامەیەك لە سەرووی خۆمانەوە دەربارەی چۆنییەتی ڕووداوی ناوبراو و ئەو سوکایەتییانەی کە عەبدوڵا ئەفەندی و هاوڕێکانی ڕووبەڕووی بوونەوە و، ئەو یاداشتەی کە لە چاودێری سەربازییەوە و ئەو برووسکەیەش کە لە ویلایەتی وانەوە هاتوون هەر دەربارەی ئەم بابەتە بوون و، (صدرالدین ئەفەندی) دانرا بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بە پێی پێویست، بۆیە لە ئێستادا ئەوەی چاودێری ناوخۆیی داوای کردووە بە پێوەندیکردن بە سەفارەتی ڕووسیاوە پێویست نییە، چاوەڕوان دەکرێت ئەو پێوەندییە چی لێ دەکەوێتەوە، ئەو زانیارییانەی کە لە داهاتوودا سەفارەت قبوڵیان ناکات دەیخەینەڕوو.

٥ی ڕبیعی یەکەمی ساڵی ٣٣٢ و ١٨ی شوباتی ساڵی ٣٢٩

لە چاودێری دەرەکییەوە

**DH.KMS. 3/35**

**چاودێری ناوخۆیی**

**٢٥ی شوباتی ساڵی ٣٢٩**

**بۆ ویلایەتی وان:**

پێشتر لای بەڕێزتان چەندین جار ئەوەمان خستۆتەڕوو کە پێویستە پێوەندی بە هێز لە گەڵ هەردوو دەوڵەتی ئێران و ڕووسیادا هەبێت، لەسەر کاریگەریی ئەو برووسکانەی کە لە ڕێکەوتی جیاجیادا هاتن دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو سوکایەتییەی کە لە

لایەن سمکۆ و هاوکارەکانییەوە ڕووبەڕووی یوزباشی عەبدوڵا ئەفەندی فەرماندەی (١٩)ی بەشی سنووری باجرکە و هەندێ لە هاوکارەکانی بووەوە، ئەو پێوەندییانەی کە لە گەڵ دەوڵەتی ئێراندا هەبوو چاودێری سەربازی بە هەمان شێوە دەرکی پێکردبوو و، ئێمە یاداشتنامەیەك دەنێرین لە گەڵ وێنەی ئەو یاداشتنامەیە بۆ چاودێری دەرەکی بە چاوپۆشین لە پێوەندیکردن بە سەفارەتی ڕووسییەوە لەمبارەیەوە، لەمەودوا بەڕێزتان ئاگادار دەکەینەوە لە هەر زانیارییەکی نوێ کە لە ئەنجامی پێوەندییەکاندا وەدەست دێن.

## DH.KMS. 3/35

**بابی عالی – چاودێری ناوخۆیی**

**ئەو شفرەی لە ویلایەتی وانەوە هاتووە:**

پاشکۆی برووسکەی ڕێکەوتی ١٢ی شوباتی ساڵی ٣٢٩.

سمکۆ لەگەڵ کونسوڵی ڕووسیا (میسیۆ جرکوف) بۆ تەبرێزیان نێردرا و، جارێکی دی ڕێگای پێدرا کە بۆ ناوچەی (جهاری) سەر سنوور بگەڕێتەوە و، ئامادەیی خۆی دەربڕی لەسەر هەستان بە دەستدرێژیکردنەوە سەرلەنوێ و، ئەوەی پێشتر زانرابوو کەوا دەوڵەتی ئێران هیچ شتێك دژی سمکۆ ناکات، چونکە وەك کارمەندێکی ڕووسی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا و دەشیان پاراست و، سەبارەت بە (شاویش یحیی)ش دوای ئەنجامدانی ڕێوڕەسمێکی سەربازی بۆی لە لایەن ڕووسەکانەوە لە سەڵماس نێژرا، ڕووسەکان وا تێگەیشتن کە کارەکە بەمشێوەیە تەواو بووە، بەڵام ئەوەی بووە هۆی ڕوودانی کارەساتەکە، سمکۆ بوو و، هەر ئەویش ڕێگاخۆشکەر بوو، بۆیە ئێمە لێرەدا بەردەوامبوونی پێوەندی سیاسی لە گەڵ سەفارەتی تاران بە پێویست دەزانین لە گەڵ دوورخستنەوەی سمکۆ بە دڵنیایی لە ناوچە سنوورییەکاندا، ئەگەر ئەم هەوڵەش لە دەست دەرچێ بارودۆخەکە باش نابێت. تکایە بۆ ئاگاداریتان.

٢٤ی شوباتی ساڵی ٣٢٩،

والی تەحسین

**DH.KMS. 3/35**

**چاودێری ناوخۆیی**

**٢٧ی شوباتی ساڵی ٣٢٩**

**بۆ مەقامی سەدارەتی باڵا:**

وەڵامی یاداشتنامەکەتان بە ژمارە (٢٠٥٣) لە ڕێکەوتی ٢٣ی شوباتی ساڵی ٣٢٩، پێشتر ویلایەتی (وان)م ئاگادار کردەوە دەربارەی ئەو پێوەندییانەی کە سەفارەتی سوننی ئەنجامی دەدات لە تاران، بۆ ئازادکردنی یوزباشی عەبدوڵا ئەفەندی و ئەوانەی کە لە گەڵێدابوون، کە ڕووبەڕووی سوکایەتی و ئازاردان ببوونەوە لە لایەن ئەو ناوانەی کە سمکۆ سەرکردایەتی دەکردن و، سزادانی دەستدرێژیکاران زۆر بە توندی لە گەڵ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی ئەم کارانە لە داهاتوودا، بەڵام ویلایەتی ناوبراو برووسکەیەکی نارد و تیایدا ڕوونی کردەوە کە سمکۆ لە گەڵ کونسوڵی ڕووسی لە (خۆی) میسیوجرکوف برووسکەیەکیان ناردووە بۆ تەبرێز کە ڕێگای پێدراوە جارێکی دی بگەڕێتەوە ناوچەی جهاری سەر سنوور و، دووبارە ئامادەیی خۆی دەربڕییەوە بۆ دەستدرێژیکردن و، پێشتر زانرابوو کە دەوڵەتی ئێران هیچ شتێك ناکات دژی سمکۆ کەوا بە یەکێك لە کارمەندەکانی ڕووسی دادەنرا و هەر ڕووسەکانیش دەیانپاراست و، شاویش یحیی لە سەڵماس نێژرا دوای ئەنجامدانی ڕێوڕەسمێکی سەربازی بۆی لە لایەن ڕووسەکانەوە و، ڕووسەکان باوەڕیان وابوو کە کارەکە کۆتایی دێت بەم شێوەیە و، پێویستی کارەکە وادەخوازێت کە سمکۆ لە ناوچە سنووریەکان دووربخرێتەوە و، ئەگەر ئەم هەلە لەدەست بچێت ئەوا بارودۆخەکە بە هیچ شێوەیەك چاك نابێت و، دەبینین کە ڕاگەیاندنی سەفارەتی سوننی لە لایەن ویلایەتی ناوبراوەوە خرایە ڕوو و، چاوپێداخشاندنەوەی سەفارەتی ڕووسی بە شێوەیەکی نارەسمی لەمبارەیەوە وابەستەیە بە ڕای بەڕێزتانەوە.

**DH.KMS. 3/35**

**بابی عالی- چاودێری ناوخۆیی**

**بەڕێوەبەرایەتیی گشتی بۆ کاروباری سیاسی**

**وێنەی بەشێك لەو نامانەی کە لە سەفارەتی سونیییەوە لە ستۆکهۆڵم بە ژمارە ٣٧ی تایبەت لە ڕێکەوتی ٧ی نیسانی ٩١٤ هاتوون:**

ڕۆژنامەی (سونسقا داغبلادت) لە ژمارەی ڕۆژی دووشەممەیدا کە لە ستۆکهۆڵم دەرچووە، ئەو برووسکەیەی تێدا بڵاوکراوەتەوە کە لە ئەستەنبوڵەوە نێردرابوو دەربارەی دەستدرێژی سەر کوردەکان، بۆ ئەوەی بڵێن هەوڵی تازەی عوسمانییەکان بۆ هێنانی ئەو گەلانەی کە لە بێ یاساییدا ژیانیان بەسەر دەبرد بۆ نێو ژیانی یاسایی و شارستانییەوە، بەڵام ئەم هەوڵە ڕووبەڕووی کێشە و گرفت بووەوە کە ئەمجارە ڕووسیا باسی کرد و، ئەگەری ڕوودانی کێشە و دووبەرەکی هەیە لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا، ئەو ڕۆژنامەیە هەتا ئێستاش بە بڵاوکردنەوەی نووسینی خراپ لەسەر دەوڵەتی عوسمانی ناسراوە، بەڵام تێڕوانینی بۆ ڕاستییەکان لە ئەنجامی ئەو مەترسیانەی ڕووس بوو کە چەند مانگێك لەمەو پێش لە سوید بڵاو ببووەوە و، جەختکردنەوەی ڕای گشتی سوید لە ئەندازەی قۆستنەوەی هەڵەکان لە لایەن ڕووسەوە تا هەستێت بە بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و تێکدانی ئاسایشی نێوان دەوڵەتە هاوسێکان.

ئەو پوختەیە نووسراوە بۆ ئەوەی پێشکەش بکرێت بە چاودێری ناوخۆیی (**طلعت** پاشا).

## DH.KMS. 3/35

**بابی عالی – چاودێری ناوخۆیی**

**شفرەی هاتوو لە ویلایەتی (وان)ەوە:**

ئەو برووسکەیەی کە لە فەرماندەی کەتیبەی (٩٧) لە (کوار)ەوە هاتووە بۆ جێگری فەرماندەی فەیلەق، کە تێیدا هاتووە و دەڵێت: فەرماندەی بەشی (١٩)ی سنووری باجرکە یوزباشی عەبدوڵا و ملازم اسماعیل و صیدلی شوکت و لە گەڵ شاویش و چوار لە سەربازەکان، لە کاتێکدا کە دوێنێ دەگەڕانەوە لە خاڵی پشکنینی (کائن) لە گوندی (بانی) سەر سنووری ئێران بۆ (باجرکە) لە کاتی نێزیکبوونەوەیان لە شوێنی (کلکانی) ڕووبەڕووی ڕێگری لە لایەن چەتەکانی(عبدوی) کە سمکۆ سەرکردایەتی دەکردن بوونەوە، لەم ڕووبەڕووبونەوەیەشدا شاویش یحیی قۆڵی بریندار بوو و، ئەفسەرێك و هەندێ کەسی دی لە لایەن ئەم چەتانەوە دەستگیرکران، پاشان بەرەو گوندی (کیتد) لای ئێرانیان بردن و شانە چەکدارەکانیان لە دەوری کۆکردەوە و، کارەکە لە گەڵ فەماندەی فیرقە (إبراهیم بەگ) تاوتوێ کرا و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، ئەویش قائمقامی قەزا و فەرماندەی کەتیبەی (٩٧) و هێزی پێویستی نارد بۆ شوێنی ڕووداوەکە، شاهبەندەری ڕۆمی (دەگونجێت ئورمییە بێ. و.) و خۆی لەمبارییەوە ئاگادار کردەوە، دەرکەوت کە یوزباشی بێئاگایی خۆی لەم کارە ڕاگەیاند و، بەیەکدادان ماوە ماوە لە (بانی و کلکانی) ڕووی دەدا و، هەواڵگرییەکان پێشتر ئاماژەیان بەوەدا کە سمکۆ دەیەوێت کارێکی خراپ ئەنجام بدات، هیچ لەوە نەدەچوو سمکۆ کاری وا ئەنجام بدات، ئەگەر هەڵنان و هاندانی ڕووسەکان نەبوایە، گومانی تێدایە ئەوان ئەفسەر و کەسەکان دەگێڕنەوە، بەڵام چەك ناگێڕنەوە و، کارێکی سەرکەوتوو بوو ئەگەر ڕاستەوخۆ دوای ڕووداوەکە خەڵکمان هێنابایە سەر سنوور، ئەفسەرەکانمان گێرابانەوە و زۆرداراغان کردبانە پەند، بەڵام نەیانتوانی ئەم کارە بکەن بە هۆی بوونی ئەفسەرێك کە ئاراستەی دەکردن و، لە کاتی نەگێڕانەوەی یان دواکەوتنی گەڕانەوەی ئەفسەرەکان ئەوا هێزی سەربازی دەنێرێت، لەگەڵ ئەوەدا پێشنیار دەکەین کە بابی عالی پەنا بۆ پێوەندیی سیاسی بەرێت و، ڕوودانی کارەساتی لەم شێوەیە لە داهاتوودا بە دوور ناگیرێت، بە هۆی هەڵسوکەوتی نابەرپرسانەی ئێران و ڕووسیا و، هەریەکێك لەمانە بەرپرسیارەتی دەخاتە سەر ئەوی دی.

٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣٢٩ (١٩١١ز)

والی تەحسین

## DH.KMS. 3/35

**بابی عالی – چاودێری ناوخۆیی**

**شفرەی هاتوو لە ویلایەتی (وان)ەوە:**

پاشکۆی برووسکەی ڕێکەوتی ئەمڕۆ، هەریەکە لە ملازم ئیسماعیل و صیدلی شەوکەت گەڕانەوە بۆ باجرکە و، ئاگاداریان کردنەوە بە بوونی یوزباشی عەبدوڵا شاویش و سەربازێك لە گوندی کولەکێنی لە نێو بەشی ڕۆژهەڵاتی ئێران و، وردەکاریی پێویستی دەربارەی بابەتەکە تێدا نەهاتووە و، چاوەڕوانین کە هەریەکە لە فەرمانـدەی ناوچەکە و قائمقامی قەزاکە شوێنی ڕووداوەکەیان بینیوە هەست بەم کارە بکەن، لە دواییدا دەنێردرێت بۆ خستنە ڕووی ئەنجامەکە.

٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣٢٩

والی وان: تەحسین

## DH.KMS. 2-1/36

## ca. 1332 .٢٩

دەبێت هەر بگات بە تەڵعەت بەگ، دوای قوربانیدانێکی زۆر توانی محەمەد جمال ئەفەندی کوڕی حاجی ئیبراهیمی سەعدی کە پێشتر باج و سەرانەی کۆدەکردەوە وەکو نووسەرێك لای ڕێکخراوە کوردییەکان کاری دەکرد، کە عەبدولڕەزا[11] و هاوڕێکانی سەرپەرشتییان دەکرد، وا لێبکات کە بە هۆیەوە زانیارییەکی زۆر کۆ بکاتەوە لەسەر ڕێکخستن، ناوبراو لە گەڵ سەعید بەگ چوو بۆ گوندی ماسوور، دوای چەند ڕۆژێك لێرەوە کەسێك دەنێری هەڵدەستێت بۆ کردنەوەم لە جووڵەکانی ڕێکخستن و، ناوبراو داوای مووچەی مانگانەی دەکرد لە گەڵ لێبوردنیدا لە سەر ئەوەی مامێکی خۆی

(١١) مەبەست عەبدولڕەزاق بەدرخانە (١٨٦٤-١٩١٨ز)، کە ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی و ڕۆشنبیریی کورددا بینیوە، بڕوانە: جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوریی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، و. لە ڕووسیەوە، ئەنوەر قادر، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣، ل١٠٥ ئەوانی دی؛ سەلاح محمد هروری، عبدالرزاق بەدرخان (١٨٦٤-١٩١٨ز)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.و.

بەقەزا و قەدەر کوژراوە، واتە کوژرانەکە بە مەبەست نەبوو و، بەڵێنم پێدا ئەگەر بەردەوام بێ لە خزمەتکردن ئەوا هەموو داواکاری بۆ جێبەجێ دەکەم و، ئەگەر ئێمە کارە گرینگەکان بخەینە پێشەوەی کارەکانمانەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە بەسەر هەموو خیانەتکارانی نیشتماندا زاڵ دەبین، ئەگەر لەو پێناوەدا (پشت بە خوا) هەندێ پارەم دەوێت و، کونسوڵ بۆ ئەم کارانە هەموو مانگێك سەدان لیرەی سەرف دەکرد.

بەشێوەیەك بۆ سمکۆ و هاوکارەکانی مانگانە تەنیا (٣٠٠) لیرەی پێ دەدات، ئەوەی من لێرەدا دەمەوێت بریتییە لە (٢٠) لیرە و، پێویستە ئەم بڕە پارەیە هەموو مانگێك بە شێوەیەکی ڕێکوپێك پێمان بگات بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجامێکی باش و، وادەزانم گونجاوە کە برووسکە وەڵامێك بنێرین بە کۆدەنگی هەموومان، چونکە پێوەندیکردن لە ڕێگەی پۆستەوە (٢٥) ڕۆژ دەخایەنێت و، پێویستە لەسەرمان کە کار بکەین لە پێناو خۆشگوزەرانی نەوەکانمان و سەلامەتی دەوڵەتی عوسمانی هەتاهەتاییمان، داوای سەرکەوتن دەکەین لە (خوای گەورە).

گەورەم، دەڵێن پۆستەچییەکی گەڕۆك هەموو هەفتەیەك لە سنوورە دێت بۆ ئێرە و ئەو بروسکە و نامە ڕەسمیانەی کە هەن دەیانهێنێت بۆ ویلایەتەکانی دەوروبەر، دوێنێ ئەو پیاوە هات و ژمارەیەك پەڕاو و دوو برووسکەم پێدان، یەکێك لە بروسکەکان بۆ گەورەمان و ئەوی تریشیان بۆ ماڵەوە بوو، ئەگەر بروسکەیەك لەوپەڕی سنوورمانەوە لە ئەنادۆڵەوە بێت بە ڕاستی کارێکی سەرسوڕهێنەرە بۆیە لەبەر ئەو هۆیە ناردم.

لە دوای ماندووبوونێکی زۆر گەیشتنییە ئێرە، بەڕاستی وڵاتێکی دوورە، بەفر بۆ ماوەی چوار ڕۆژ دەباری بەبێ پچران، بەهەر حاڵ خۆمان پەنا دا، پێش ئەوەی تووشی گەردەلول ببین، ئەو کونسوڵە ڕووسییەی کە دوێنێ هات وەك کاردانەوەیەك بوو بۆ سەردانەکەم، کە دەیگوت هاوینی ئێرە وەك دۆزەخ گەرمە، گەرمی و ساردی و نێزیکی و دووری گرینگ نییە، بەڵکو ئەوەی کە منی تووشی دڵەڕاوکێ کردووە ئەو زۆرداری و دڕندایەتییەیە کە ڕووس پەیڕەوی دەکات، لە هەمان کاتدا دوو نامە دەنووسم دەبینم دوو کەس لە (قازاق) هەریەکەیان گۆچانێکە بەدەستەوە گرتووە و هێرش دەکەنە سەر ئەوەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە وەکو سەگی دڕ، ئەگەر ئەمەش ڕوویدات بە فەرمانی یەکێك لە ئەفسەرەکانیانە، هەمان ئەو زۆرداریيانەی کە لە بەلقان هەیە لێرەش

دەبینرێت، لە بەلقان چوار سەرباز و دوو ئیشککگر و دوو چەکدار هەن بۆ پارێزگاریکردن لە (شاهبندر) بە بەردەوامی، لە گەڵ ئەوەدا ئەو ژوورەی کە مـن تێیـدا دەخـەوم، دوو تفەنگ و نێزیکەی سێسەد گوللەی لێیە و، دەمانچەکەم بەردەوام لە گیرفانمدایە، کەواتە ئێمە لە نێو ئاگرداین، بۆچوونی من ڕاست بوو کاتێك هـاتم و کەسـوکارەکەم لـە گـەڵ خۆمدا نەهێنا، ئەگەر بمهێنابانایە هەستیان بە نارەحـەتی و دڵتـەنگی دەکـرد، چـونکە نەیاندەتوانی بچنە دەرەوە، بەتایبەتی کە ئەوان ڕانـەهاتبوون بـەوەی کـە جنێوێـك بـە ئافرەتی موسڵمانان بدرێت و سوکایەتییان پێ بکرێت، هەموو کاتـەکانی خـۆم لـە نێـو کونسولخانە بەسەر دەبرد و بەکاری هەواڵگرییەوە سەرقاڵ دەبووم تـا کاتـژمێر (١٢)ی شەو، ئەگەر ئەو هەموو قوربانییەمان پێشکەش کرد تا گەیشتووینە ئێرە هـیچ کـەمتر نییە لەوەی کە هەندێك خزمەتگوزاری لە بەرژەوەندیی شار و وڵاتەکەم پێشکەش بکەم، ئەوانەم پێشکەش کردن لەو ڕاپۆرتانەی کە نووسیومن، ئەگەر ئـەو ڕاپۆرتـە بـۆ بەشـی چاودێری یان سەفارەت نێردرابان کێ گرینگی پێ دەدان و دەیخوێندنەوە؟ لە یـەکیك لـە سووچەکان فڕێ دەدران، لەبەر ئەوە ئەگەر بینیم شتێکی گونجاوە داوا دەکەم لە ڕێگـەی (جەعفەر بەگ) و هەندێ لە کەسانی دی لە دەزگا گشتییەکاندا ئـەو پـەڕاوە هاوپێچـە بخوێننەوە، ئەو کارە گرینگییەکی زۆری هەبوو، ڕووسەکان دەیانویست ڕکوکینە لە نێوان کوردەکان و ئەرمەنەکاندا دروست بکەن، بەڵام ئامادەکارییەکانیان بۆ ئەم کـارە سـەری نەگرت، دوێنێ پیاوێکی سووك (خراپ) بە ناوی (سەعید) کە یەکێك بـوو لـە پیـاوانی (عەبدولرەزاق) هات بۆ ئێرە، زانیمان کە ڕووسەکان فیشەکێکی زۆریان پێداوە، منـیش دوو کەسـم بـۆ چـاودێریکرنی دانـا، کاتێـك فیشـەکەکان ڕادەسـت دەکـات بەرپرسـی سنوورەکەمان (مأمور)ی لێ ئاگادار بکەنەوە، وا تێدەگەم بۆچوونی ڕووسەکان بەرامبەر ئەنادۆڵ زۆر خراپە، داوا دەکەین لە (خوای گەورە) کۆتاییەکەی بە چاك بگێڕێت... ڕێزو سڵاوم هەیە بۆ دەوڵەتەکەتان.

**١٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٩**

**بەندەتان: حـەسن تەحسـین**

**چاودێری ناوخۆیی**

**٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٢٩ (١٩١١ز)**

**بۆ بەڕێز ویلایەتی وان:**

پاشکۆی نووسراوی ژمارە(...؟)ی ڕێکەوتی (١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٢٩) وێنەی ئەو نامەیەی کە لە بریکاری شاهبەندری خۆی و سەڵماسدا هاتووە بە پێچراوەیی بۆتان دەنێرین، کە ئێمەش لە چاودێری دەرەکییەوە پێمان گەیشتووە، دەربارەی ئەنجامی پێکدادانی نێوان سمکۆ و پیاوەکانی لە لایەك و ئیسماعیل ئاغا و تیمور و هنارە جفتو لە خێڵەکانی قاروار لە لایەکی دیکەوە... تکایە بۆ ئاگاداریتان.

**فەرمانگەی برووسکەی دەوڵەتی عیللی عوسمانی**

**٣٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٢٩**

**بۆ بەڕێز چاودێری ناوخۆیی:**

ئەو سمکۆیەی کەوا چەند ساڵێك بەر لە ئێستا ڕووبەڕووی دەستدرێژییەکانی بووینەوە، وەك خوێنرێژێکی ئاسایی چەند ساڵێك لە ژێر پارێزگارییەکی گەورەدا بوو (مەبەست پارێزگاری ڕووسە و.) و، زوڵم و زۆرییەکی زۆری دەرهەق بە ماڵ و گیانی ئەرمەنییەکان پەیڕەو دەکرد، داوا لە دەوڵەتمان دەکەین ئەو مەترسییەی کە ئەو خوێنڕێژە و هاوکارەکانی دەیکەن لای بەن و نەیهێڵن.

نوێنەری ئەرمەنەکان لە پاش قەڵا

**DH.KMS. 2-1/36**

**بابی عالی – چاودێری ناوخۆیی**

ئەگەر بارودۆخی خێڵەکان بەدەر خەین ئەوا موسڵمانەکانی ناوچەی (شکفتی) نە قوتابخانە و نە مزگەوتیان نییە و، مانەوەی ئەم خەڵکەش بەمشێوەیە لە سەر سنوور جێگای داخ و پەژارەیە و، بە هۆی نەبوونی توانای ماددی و هەژارییەوە ناتوانرێت

دەرسیان پێ بگوترێت بە پێی یاسای وانەوتنـەوەی سـەرەتایی، بـەڵام ئەگـەر چـاودێری زانیاری یاسایەکی تایبەتیان بۆ دەرکات ، لەوانەیە بتوانرێت هەستن بەم هەوڵە و، ئێستا وا دەخوازێت، کە چاودێری کشتوکاڵی هەستێت بە دەستپێشخەری، چـونکە زەوییـەکان زۆر بە پیتن و هیچ کەسێکیش نییە بیانکات بە کشتوکاڵ، لەبەر ئەوەی خەڵکەکەی زۆر هەژارە و ناتوانن کشتوکاڵ بکەن، ئەگەر چاودێری لە بوودجەی گشـتی بـۆ ئـەم لایەنـە خەرج بکات و نێزیکی سی تا چـل (٣٠-٤٠) گاسـنی (ئـامێری کێڵانـی زەوی) نـارد بۆیان، ئەمەش کارێکی باش بوو، بەڵام ئەو ڕووسانەی کە لەوێ بوون لـە بـارودۆخێکی پێشکەوتوودا بوون.

**٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٢٩**

**والی وان لە ناحیە/ تەحسین**

## بابی عالی - چاودێری ناوخۆیی

### ئەو شفرەیەیی کە لە ویلایەتی (وان)ەوە هاتووە:

من بۆ ماوەی دوو ڕۆژە لە ناوچەی (شکفتی) سەر سنووری ئێرانم، لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیە لە (جهاری) نێزیکە و سمکۆش لەوێیە، هەستام بە لێکۆڵینەوە لەسەر ناوبراو و، ناوچەی شارۆچکەی شکفتی زۆر بەختیار و ئاوەدان بوو، ئەو خەڵکەی کە تێیدا دەژیـان پێکهاتبوون لە خێڵەکانی ئەرمەن، بەڵام بە هۆی ئەو دەسـتدرێژییانەی کـە لـە مـاوەی پانزە ساڵدا ڕووبـەڕووی بوونـەوە لـە لایـەن عەبدەوییەکانـەوە کەوتوونـە هەژارییـەکی کوشندەوە.

ئەگەر خێڵەکان بیانتوانیبا بە هێز کەمێکیش بەرەنگاری عەبدەوییـەکان بکـەن کـە سمکۆ سـەرکردایەتی دەکـردن ئـەوا ئەرمەنییـەکانیان دەهـاڕین و زۆر خراپیـان بەسـەر دەهێنان و، هەر گوندێکە ئەرمەنی کە پێدا ڕۆیشـتبام خەڵکەکـەی هـاوار و سـکالایان دەکرد دژ بە سمکۆ، ئەوان زوڵمیان لێ دەکرا، هەمیشە ئەو ڕستەیان دەوتەوە:(( کاتێـك سمکۆ تەنیا خوێنڕێژێکی ئاسـایی بـوو زوڵـم و زۆری لـێ کـردین، بـەڵام کاتێـك بـووە خوێنڕێژێك کە لە لایەن ڕووسیاوە پاڵپشتی دەکرا، ئەوا کارەکە واتە (زوڵم و زۆرییەکە) گەیشتە ڕاددەیەك سنووری بۆ دانەدەنرا)).

ڕووسەکان ڕووێکی خۆشیان لە ولایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا پیشانی ئەرمەن دەدا لایەك و بەسەرکەوتنی سمکۆ بەسەریاندا لەلایەکی ترەوە خۆشحاڵ بوون، ئەوەش کارێکی جێی گاڵتەیە، سمکۆ هەستا بە هەڵمەتێکی سەربازی بۆ سەر دەستەیەك لە (حانیك) نێزیکەی (سێ) سەربازی لێ کوشتن و دەستی بەسەر چەکەکانیاندا گرت، ئەمەش ڕق و کینەیەکی زۆری لای خەڵك دروست کرد، بۆیە پێویستە لەسەر بابی عالی لەبەرامبەر سمکۆدا سیاسەتێکی توند بەکار بهێنێت، ئەگەر نا هێزە جووڵاوەکان و تاقمە بچووکەکانی سەر سنوور هەموو ساتێك لە مەترسیدان و، بێدەنگی لە بەرامبەر ئەو تاوانانەی کە سمکۆ دەیکات دەوڵەت هەڵدەوشێنێتەوە و ئەرمەنەکانیش سکاڵا دەبەنە لای بابی عالی دژ بە سمکۆ و، پێویستە ئەمە بەهەند وەربگیرێت و بکرێتە هۆکارێك بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی سیاسی توند و بەهێز، چونکە سمکۆ لە بەشی ڕۆژهەڵاتدا لێی ناپرسرێتەوە لەوەی کە دەیکات لەبەر ئەوەی ئەنجامەکەی جێگای ڕەزامەندی ئەوانە، دوێنێ قوتابخانەی ڕووسی و کوردییان کردەوە لە (خوێ)[١٢] لە وتارەکانی ڕووسدا دەرکەوت کە زیاتر دەستخۆشییان لێ بکات و هانیان بدات و، سەفارەتی تاران گوتی ڕێگا نادرێت بە کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە.

لەسەر ئەو شێوەیەی کە پیشتر خستمەڕوو، چەکدارکردنی هەندێك کەس لە ڕێگەی دروستکردنی یاسای پاسەوانی لە گوندەکانی ئەم ناوچەیەدا ئێستا کارێکی پێویستە، زۆر ئاسانە گێڕانەوەیان دوای کۆتاییهاتنی کێشەی سمکۆ و، بابەتی زەوییەکانیش نێزیك بوون لەم کردارە، بۆیە تکامان وایە بەگەیاندنی پارەی پێویست و باسکردنی ئەرمەنەکان کە لەبەر ئەم هۆیە دەبن بە پاڵپشتی دەوڵەتی ئێستا و، ڕێز و سوپاسی تایبەت پێشکەش دەکەین بە بابی عالی.

---

(١٢) مکۆ و عەبدوڕەزاق بەدرخان دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی گەیاندن (١٩١٢-١٩١٣)ز لە شاری خوێ، بە هاوکاریی ڕووسەکان ئەم قوتابخانەیان بۆ منداڵانی کورد کردەوە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:جەلیل جلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلایەتی و..، ل١٣٠-١٣٧. و.

**چاودێری ناوخۆیی**
**٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ٣٢٩**
**بۆ مەقامی سەدارەتی باڵا (نهێنی):**

ئەو برووسکە نهێنییەی کە لە ویلایەتی وانەوە هاتبوو بە پێچەوانەیی پێشکەشمان کردن، دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکی شارۆچکەی شکفتی سەر سنووری ئێران بۆ ئەو دەستدرێژی و زوڵمەی کە لە لایەن عەبدەوییەکان و سەرکردەکەیان سمکۆوە دەکرایە سەریان و، وێنەی ئەو برووسکەی کە لە نوێنەری ئەرمەنەکانەوە لە پاش قەڵا هاتبوو، بە تکاکردن بۆ نەهێشتنی زوڵم و زۆری لە سەر ماڵ و گیانی ئەرمەنەکان کە لە نێزیک سنوورەکانی ئێرانەوە ڕووبەڕووی دەبوونەوە لە لایەن سمکۆوە.

ئەوەش بە شێوەیەکی ڕەسمی لە لایەن ڕووسەکانەوە پارێزراون لەبەر گرینکیی ئەم دوو برووسکەیە و ئەو بارودۆخە مەترسیدارەی کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵات هەبوو، بۆیە دەستپێشخەری کردن لە هەستان بە دانانی سنوورێك لە لایەن دەوڵەتی ڕووسیاوە، بۆ ئەو دەستدرێژیکردن و زوڵم و زۆرییەی کە ناوبراو و هاوکارەکانی دەیانکرد پەیوەستە بە ڕای بەڕێزتانەوە.

**DH.KMS. 2-1/36**
**بابی عالی – فەرمانگەی ڕۆیشتوو**
**بۆ بەڕێز چاودێری ناوخۆیی:**

ئەو شفرەیەی کە لە ویلایەتی وانەوە بۆمان هاتووە دەربارەی گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی کاریگەر لەسەر گێڕانەوەی (٧٠٠) سەر مەڕ و شتی دی، ئەوانەی کە سمکۆ و هاوکارەکانی دەستیان بەسەرداگرتووە لە خەڵکی گوندی ئەستبسانی سەر بە مەڵبەندی هەکاری و، وێنەی ئەو برووسکەی کە لە ویلایەتی وانەوە هاتووە دەربارەی ئەو دەستدرێژییانەی کە خەڵکی شارۆچکەی شکفتی کائنی سەر سنووری ئێران ڕووبەڕووی بوونەوە لە لایەن عەبدەوییەکان بە سەرکردایەتیی سمکۆ و، وێنەی ئەو برووسکەیەی کە لە نوێنەری ئەرمەنییەکان لە باشقەڵاوە هاتووە بۆ تکاکردن بە مەبەستی پاراستنی ماڵ و سامانی ئەرمەنییەکان لەو زوڵم و زۆرییەی کە لە نێزیك

سنوورەکانی ئێران لە لایەن سمکۆوە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، سمکۆ بە شێوەیەکی ڕەسمی لە لایەن ڕووسیاوە دەپارێزرا، بە پێچراوەیی یاداشتنامەکەتان بە ژمارە (١٤٥٢) لە ڕێکەوتی (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی ٣٢٩دا و هەموو ڕاگەیاندنێکی پێویستمان دا بە بەڕێز چاودێری ناوخۆیی، لەبەر ئەمە وێنەی وەڵامی یاداشتێکمان بە پێچراوەیی نارد بە ژمارە ١٠٥٥ -٤٠٩٤٦ لە ڕێکەوتی ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٩دا کە لە چاودێری ئاماژەپێکراوەوە هاتووە لە هەستانی سەفارەتی سوننی لە بترسبۆرگ دەربارەی ئەوەی لە کۆبوونەوەکاندا دەگوزەرێ لە گەڵ بەڕێوەبەری لقی کاروباری ئێران لە چاودێری دەرەکیی ڕووسی، لە گەڵ ڕاگەیاندنی ئەو وەڵامەی کە بەرپەرچ دەدرێتەوە لە سەفارەتی سوننی لە تاران.

لە ١٢ی سەفەری ساڵی ٣٣٢ و ٢٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٩

لە صەدری ئەعزەمی ڕاوێژکارەوە

## DH.KMS. 2-1/36

لە ڕۆژی سێیەمی گەیشتنم بۆ ئێرە بە بۆنەی ساڵڕۆژی ئیمپراتۆری ڕووسیا بەدەنگ ئەو بانگەوازییەوە چووم کە کونسوڵی ڕووسی مسیو(جریقون) ناردی بۆم، کە لە هۆڵی پێشوازی لە کونسوڵیە لەو ڕۆژەدا سەرکردە سەربازییەکانی پێنج تابورەکانی (خوێ) و کارمەندە گەورە فەرمییەکانی ناوچە لەوێ ئامادە بوون، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، پیاوێك بوو جلوبەرگی نەتەوەیی کوردی لەبەردابوو، دوای لەو لێکۆڵینەوەی کە کردم دەربارەی ڕوون بووەوە کە پیاوێکە بە ناوی سمکۆ، سەرۆکی خێڵە عەبدەوییەکانی ئێرانە و یەکێك بوو لە خوێنڕێژە ناودارەکان و، ڕووسیا هەموو پیاوەکانی چەکدار کردن بە گوللەی بیکەیسیی بچووك و، ناوبراویش پێش داگیرکردنی ئازەربایجان لە لایەن ڕووسیاوە بۆ ناوچە سنوورەکان نێردراوە و، بە چەندین کاری دزی و ڕاوڕوت لە ناوچەکانی سەر بە دەسەڵاتی عوسمانییەکان هەستابوو و، لە نێو ئێرانیشدا زۆر تاوانی کوشتنی بێ بەزەیی ئەنجام دا، تاوانەکەی ئێستا تەنیا لەسەر دەسەڵاتی عوسمانی کورت دەکرێتەوە.

وەك ئاشكرایە لای بەڕێزتان ئەگەر تەنیا یەك یان دوو لەمانە جیا بکەینەوە کەواتە کاری بنچینەیی کونسوڵی دەوڵەتە دۆستەکان پێش داگیرکردنی ویلایەتی مناستر و قوصوە و سلانیك بریتییە لە پێوەندیی بەردەوام لە گەڵ سەرۆکی چەتەکان و پاراستنیان بە پێی توانایان و، تاکە هۆکار بۆ ئەو ئەنجامە شومەن بەرامبەرمان، ئەویش هەستانی ئەفسەرەکانە لە ژێر ناونیشانی کارمەندی سادە لە نێو کونسوڵەکانی بە ئاراستەکردنی لیژنە شۆڕشگێرییەکان بە هەموو جووڵە و وروژانێکیانەوە، وەك لای خۆم مسیون جریقوف دانی ناوە بەوەی کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ خزمەتی کردووە لە کونسوڵییەی (سلانیك) کە کاری گرینگ و ترسناکی هەبووە و لە بریزرن و وسکوبیا و مناستر و، دوای داگیرکردنی ئەو ناوچانە لە لایەن ڕووسیاوە و، لەسەر خزمەتەکانی پێشووی لە لایەن دەوڵەتەوە خەلات کرا، بە دامەزراندنی وەك کونسوڵی خوێ و سەڵماس، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان سەرۆکی چەتەکانی ئەو ناوچانە بوون، بە پێی ئەو شتە باوەڕپێکراوانەی کە بیستوومە، سمکۆ پێش چەند مانگێك ئامۆژگارییەکی لە کونسوڵەوە نارد بۆ تفلیس، بۆ ئەوەی بیکات بە دادوەری گشتی قەوقاز، کە لە لایەن والییەوە ڕێزێکی زۆری لێ گیرا، لە دوای گەڕانەوەی خۆی و ئەوەی کە لە گەڵیدا بوون لە چەتەکان بەکار دەهێنرێن لە نێو نەخشەی کونسوڵیەت و فەرماندەی سەبازیدا.

حاڵەتی دەروونی ئەو کەسانەی کە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژانەدا بینیمن بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە گیانی نیشتمانی و سۆزی نەتەوایەتی لە نێو خەڵکی ئازەربایجاندا نەماوە و، گەورە کارمەندەکان و کەسە ناودارەکان لە لایەن ڕووسەوە ڕازی کراون بە وەرگرتنی سامان و بەرتیل، بەڵام خەڵکەکە ترسنۆك بوون بە شێوەیەك سێ تا چوار سەرباز دەیانتوانی سەرپەشتی سەدان کەس بکەن، نموونە لەسەر ئەمە، کەسێکی دڕندەی لە کەسەکانی ڕووس ویستی لەبەر چاوی خەڵکێکی زۆر دوێنێ ئێوارە چەکەکەی تاقی بکاتەوە لەسەر پیاوێکی هەژار، بەمشێوەیە هەموو لاشەی بەر فیشەکدا هەتا گیانی دەرچوو، خەڵکیش بێدەنگ بوون هیچیان نەکرد، بۆیە ڕووسەکان لەم ناوچەیەدا لە ئامادەباشییەکی تەواودا بوون بە هەموو کەلوپەلێکی پێویستەوە لە گەڵ ئەندازەیەکی زۆر لەهێزی سەربازیدا بە ملیۆن دیناریشیان لە پێناو بەدەستهێنانی لایەنگری کوردەکاندا خەرج دەکرد و، لەهەوڵی ڕێگرتن بوون لەچاکسازی دەوڵەتی

سوننی لە ڕێگەی گرفتخستنە نێو ئاشتییەوە، بێگومان ئەمانە دوو ئامانجی شاراوەیان بوون.

ڕووسەکان کاریگەریی زۆریان لەسەر سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی بولغاریادا لە ساڵی ١٨٦٧ و کەنارەکانی (صونە) لە ڕۆمانیا و ناوچەکانی دووبریجەدا هەبوو و، دەوڵەتی ڕووس ڕاستەوخۆ هەمان ڕۆڵی لە(خوبی) و دەوروبەریدا گێڕا، لەهەمان کاتدا کونسوڵەکانی ڕووس سەرباری چەکدارکردنیان پارێزگاریشیان لەکوردەکان دەکرد، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سیاسەتە دوژمنکارانەکەیان لە بەرامبەرماندا لە ئێستا و لە داهاتووشدا ناگۆڕێت، بەڕای من ئەو سیاسەتە کە ئێستا دەردەکەوێت بێدەنگییە و، ئەو ڕاوەستان و بێدەنگییە ئامانجن بۆ قۆستنەوەی هەل بۆ ئامادەکاریی سەربازی لە کاتێکی دیاریکراودا[(١٣)]

٢٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٣

شاهەبندری خوێ و سەڵماس

## DH.KMS. T.1332. Ca.9/3/37

**بابی عالی- چاودێری ناوخۆیی**

**ئەو شفرەیەی کە لە ویلایەت(وان)ەوە هاتووە:**

لە برووسکەی قائمقامی کوار لە باجرکەدا هاتووە، بە پێی ئەو هەواڵانەی کە دام لە لای تەیمور ئاغا لە گوندی ماستاقان، بەڵام وەڵامەکەی ئەوەبوو گوتی شاویشی بریندار کە لە گوندی (کملەکزی) چارەسەر کرا، لە گەڵ چوار هاوەڵ لە پیاوەکانی سمکۆ بۆ زاری نێردرا، لەسەر ئەو بڕیارەی کە لە ڕووسیاوە پێی گەیشت.

٣ی شوباتی ساڵی ٣٢٩، والی: تحسین

---

**(١٣)قونسوڵییەتی ڕووسی دوێنێ شەو ئەندازەیەکی زۆری کەلوپەلی خەزنکراودا بە سەعیدبەگی سەرۆکی چەتە کوردەکان و ڕەفیق عەبدولڕەزاق، لە دواییدا سەفەری کرد بۆ گوندی (موحود)ی نێزیك سنوورەکانی عوسمانی لەوێ نیشتەجێ بوو، ناوبراو لەمەودوا دەست دەکاتەوە بە دەستدرێژییەکانی بۆ سەر دەسەڵاتی عوسمانی.**

## ((بەڵگەنامەکان لەسەر شێخ عوبەیدیلای نەهری))
## ئەو خێڵە کوردیانەی لەسەر سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانیدا نیشتەجێ بوون

**Y.A.Res.1298-18/H.1064**

**وێنەی یاداشتنامەی بریکارەکە:**

ئەو برووسکەی خستمانە بەردەم مەقامی حەزرەتی مەولانا سوڵتان کە شاهید و بەدواداچوونی تایبەتی ئەحمەد ڕاتب پاشای یاوەری سوڵتانی لە موسڵ لەخۆگرتووە، لەسەر شێخ عوبێدیلا ئەفەندی وێنەیمان ناردووە و لەدوای ئاگاداری ئەنجوومەنی ڕاسپێردراوی تایبەت بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێوست بڕیاری دا: بەپێی یاداشتنامەی عللییەی عوسمانی تایبەت بەگلەیینامەی باڵا بە برووسکەی ناوبراوەوە ناردمان، ئەم یاداشتنامەمان ئامادە کرد بۆ ڕوونکردنەوەی ویستی جێبەجێکردنی و ئەوەی لە ئیرادەی سوننییەوە لەو بارەوە دەردەچێت.

**١٨ی جومادی یەکەمی ساڵی ٩٨، ٤ی نیسانی ساڵی ٩٧، (١٦ی نیسانی ١٨٨٠)**

**سەعید**

**وێنەیەك وەکو خۆی**

**وێنەی پەڕاوێز:**

مەحزەری ئەنجوومەنی بریکارەکان هاوپێچی نمایندەیە، بۆ سکاڵانامە کە موقامی باڵا لێی ئاگادارە، لەو ڕووەوە وەکو بەدیار دەکەوێ ئەگەر عوبێدیلا ئەفەندی بەزۆر بهێنرێتە خانەی سەعادە ئەوە ناچار دەبێت پەنا بەرێتە بەر ئێران، چاودێری دەرەوە لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێرانی ڕاسپێراوە قسە لەگەڵ سەفارەتی ئێراندا بکەن هەتا داڵدەی نەدەن و دژی ئێمە بەکاری نەهێنن، موشیرییەی هومایونی لەشکری چوارەم و ویلایەتی وان ئاگادار کرانەوە بە ناوی حکومەتی سوننی لەو شوێنانەی پێویستە ئاگاداری بڵاوبکەنەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەوەی شێخ لە ڕابردوودا بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها

ئیرادەی سوننی مشیریەی ناوبراوی ئاگادار کردۆتەوە هەوڵ بدات نەیەڵێ شێخ پەنا بەرێتە بەر ئێران، مەحزەرەکە بگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

**٢٠ی جەمادی یەکەمی ساڵی ٩٨ و ٨ نیسانی ساڵی ٩٧ ــ**

**(وێنە وەکو هی ئەسڵیەکە)**

**برووسکەی ئەمیر لیوا تۆفیق ڕاتب پاشا یاوەران:**

حەزرەتی مەولانا سوڵتان ئێستا لەو دەڤەرەیە بە فەرمانی هومایونی ئەو پێوەندیانە ئەنجام دەدات، ئەنجوومەنی ئێمە بەدواداچوونی لەسەر بانگکردنی شێخ عوبێدیلا ئەفەندی کردووە، بەدواداچوون تەواو بوو لەگەڵ بیرخەرەوەیەکی تایبەت بەئیرادەی سوننی، کورتەی برووسکەکە ئەوەیە شێخی ناوبراو ئامادەیی خۆی نیشان داوە بەپیر داوای سوننییەوە بێت، بەڵام هەندێ ترسی ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیە فەرمانی لەو جۆرە قبوڵ بکات، بەڵام لەبنچینەدا مەبەستی نییە سەفەری خانەی سەعادە بکات، بەڵکو خۆی سوود لەکات وەردەگرێت هەتا ئەوەی دەیەوێ ئەنجامی بدات، ئامادەکاری و دەستدرێژییەکانی بەبۆچوون و ڕێنوماییەکانی بە ناوی دەوڵەتی عیللی نیگەرانی کردوون، لەوە دەترسێت ئەو دەنگ و باسی بانگەوازی دەوڵەتی سوننی بگات و بۆ خەڵکی دەربکەوێ کردەوەکانی و ئەوەی ڕایگەیاندوە پێچەوانەی ڕەزامەندی بالایە، ئەوکات خەڵکی لێ دوور بکەونەوە، هەندێ لەهۆزەکانیش لێی بکشێنەوە، بەمەش بێ ئومێد دەبێت و واز دەهێنێت، لەو ڕوانگەوە کوردستان بەجێ دەهێڵێت و لە بەرژەوەندی نابێت بمێنێتەوە، ئەگەر لە ڕێگەی پێوەندی بە ئێرانییەکانەوە داوای ئەمانی کرد کە لەوانەیە پەنا بەرێتە بەر ئێران، دەبێت زەمانەتی ئەوە هەبێت بە فەرمی ئەوە بەدەست نەیەت، ئەنجوومەنی تایبەت بەشێوەیەکی ڕوون لەو کارەی کۆڵیوەتەوە، وای دەبینێت ڕووس هاوشانی ئێرانییەکان نیگەرانە لە جووڵانەوە و کردەوەکانی، بە فەرمی ئەوەیان گوتووە: کە ئەگەر دەوڵەتی عیللی ڕێوشوێنی گونجاو نەگرێتە بەر ئەوە ناچار دەبن بەدوای بکەون، لە کاتێکدا شێخ خۆی بە جۆرێك لە جۆرەکان هەڵخەڵەتاوە، لەبنەڕەتەوە بانگەشەی سوننی لەسەر بڕیاری ئەنجوومەنی ئێمە لەو بارەیەوە دەیەوێت بەڕێگەیەکی

گونجاو دوور بخرێتەوە و سنوورێك بۆ ئەو سكالاّیانە دابنرێت، بەلاّم بەدڵنیاییەوە شێخ بە ڕەزامەندیی خۆی سەفەری خانەی سەعادە ناكات، ئەگەر ناچاری سەفەر بكرێت پەنا دەباتە بەر ئێرانییەكان و لەو حاڵەتە دژی ئێمە بەكاری دەهێنن، ئەو سكالاّیانەی لە ئێرانییەكان بەر گوێمان دەكەون ئەوە پێویست دەكات یەكەم جار لەگەڵ ئێرانییەكان وتووێژ لەسەر ئەو بابەتە بكەین، چونكە هەوڵ بۆ دوورخستنەوەی شێخ لە ئەنجامی سكالاّی ئێرانییەكانە دژی ئەو، لە حاڵەتی ناچاركردنی پەنا دەباتە بەر ئەوان، بۆیە لەسەریانە زەمانەتی فەرمی بدەن كە قبوڵی ناكەن، ئەگەر ئێران ئەو زەمانەتەیان نەدا، دەبێت واز لەو سكالاّیانە بهێنن، لە حاڵەتی زەمانەتدانی ئێرانییەكان ئەوە دوورخستنەوەی شێخ پێویست دەبێت، ئەنجامدانی ئەو كارە لەسەر وەلاّمی ئێرانییەكان وەستاوە، شێخی ناوبراویش بۆ هەڵخەڵەتاندنی هۆزەكانی دەوروبەری ڕایگەیاندووە ئەو كارانەی بە ڕەزامەندی دەوڵەتی عیللی كردووە، ئەوانەش كە دەبیستن وەلی ئەمر بە كارەكانی ڕازی نییە لێی دەكشێنەوە.

موشیرییەی لەشكری هومایونی چوارەم و ویلایەتی وان بە برووسكە ئاگادارمان كردوونەوە بە بڕیاری ئەنجوومەنمان ئەو قسانە بەدرۆ بخەنەوە، بۆیە وای دەبینین ناكۆكی و دووبەرەكی بكەوێتە نێوان ئەو و هۆزە هەڵخەڵەتاوەكان، لە حاڵەتی ڕەزامەندیی مەقامی بالاّ دەسەلاّت دەدرێتە چاودێری دەرەوە لەگەڵ سەفارەتی ئێرانی قسە بكات و موشیرییەت و ویلایەتی ناوبراو ئاگادار بكرێنەوە، بە ناوی حكوومەتەوە ڕاگەیاندن بلاّو بكەنەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی قسەكانی شێخ، فەرمان لە هەموو حاڵەتەكاندا بۆ وەلی ئەمری گەورەمانە.

## ١٨ی جەمادی یەكەمی ساڵی ٩٨ و ٥ی نیسانی ٩٧ (١٦ی نیسانی ١٨٨٠) واژۆكان

بیرخەرەوەی چاودێری دارایی بەڕێز خراوەتە ڕوو لەسەر ڕوونكردنەوەی ویلایەتی هەكاری بەوەی پێویستە بكرێت بۆ عەریزەی عەبدولقادر ئەفەندی كوڕی شێخ عەبێدوڵلاّ بەگ كە مووچەیەكی كەڵەكەبووی مانگانە بە ئەندازەی چوار هەزار و پێنج سەد قروش هەیە، بە شێوەی كاتی دانرابوو بۆ باوكی، لە سالاّنی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت،

داوا دەکات بە حیسابکردنی سەد و هەشت هەزار قروشی دی کە هی هەندێ لە خزمەکانی شێخ بووە بە ناوی دەیەك و میرانەی سالانەی مەڕ و مالات، هەروەها داوای کردووە ماوەی مانەوەی لە خانەی سەعادە مووچەی مانگانەی بەپێی ئیرادەی سولتانی بە شیوەی کاتی بۆ خەرج بکرێ کە لە مانگی ئازاری سالی نەوەد و هەشتەوەیە، چوار هەزار و پێنج سەد قروش لەو پارەیەی پێشوو بە شێوەیەکی کاتی هەلوەشاوەتەوە لەسەر ئەو بنەڕەتەی بە هۆی مانەوەی ئەو پیاوە لێرە ڕاگیراوە کە دەکاتە دیاریکردنی مووچەی دوایین مانەوەی لێرە، دەرفەتی هەژمارکردنی کەلەکەبووی هەردوو سالی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت نییە و لە خزمەکانی داواکراوە، کە هەلاتووە و پێویستە مووچەی ڕابگیرێت، ئەم بیرخەرەوەیەم ئامادە کردووە بۆ ڕوونکردنەوە هەتا ڕەوانەی چاودێری ناوبراو بکرێت، ئەوەی تا ئێستا ماوە حیسابی بکات و ئەوەی دەمێنێتەوە بە تەواوی لەسەر فەرمانی هومایونی ببڕێت.

**٧ی شەوالی سالی ٩٩ و ٩ی ئوگوستی سالی ٩٨ (٢١ی ئابی ١٨٨١)**

**سەعـــــید پاشا**

**Y.A. Res**
**1299- H – 2258**

باسی ئەو برووسکەی لە ویلایەتی هەکارییەوە هاتووە، لەسەر هەلاتنی شێخ عوبێدیلا بەبێ ڕوخسەت، ئێستا پێویستە فەرمانی بالا دەربچێت بۆ ڕوونکردنەوە بەناوی حەزرەتی مەولامان سولتان، ئەوەی لە برووسکەدا بەدیار کەوتووە، شێخی ناوبراو هەندێ ئاگاداری بلاوکردۆتەوە بۆ زەمینەسازیی گەڕانەوە، ئەم هەوالە وا بلاوبێتەوە کە پێچەوانەی ڕەزامەندیی بالایە هەتا خەلکی دەوروبەری هەلنەخەلێتێنێت بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی، لەکاتێکدا فەرمان دەرکردن بۆ فەرمانی بالا و ناردنی کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدات. ناردنی فەرمانی بالا لەو بارەیەوە بەبرووسکە دەوەستێتە سەر ئیرادەی سوننی حەزرەتی مەولانا سولتان، ئەو برووسکەیەمان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردووە.

**٧ی شەوالی سالی ٩٩ و ٩ی ئۆگۆستی ٩٨**

**سەعید پاشا**

**سەرۆکایەتیی وەزیران - هۆبەی برووسکەکان**

**وەڵامی برووسکەی ویلایەتی وان:**

دوێنی و لەپێشتریش ئەوەمان ڕوون کردەوە و ئاگادارمان بڵاوکردەوە، کە شێخ لەنێو خەڵك متمانەی نییە و بە قسەی سەدری ئەعزەم و ئەنجوومەنی وەزیران ناکات، بەتەنیا بە فەرمانی حەزرەتی مەولامان سوڵتان دەجووڵێتەوە، دەمانەوێ ئەوە ڕوون بکەینەوە دەرکردنی فەرمانی باڵا بۆ ڕاگەیاندنی هەڵاتنی شێخ بەبێ مۆڵەتی حەزرەتی مەولامان سوڵتان چووە بۆ ئەوێ، گرتنە بەری ڕێوشوێنی هەر سزایەك بۆ ئەو بەناوی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەتەوە دەبێت، ئەمەش وابەستەیە بەڕای چاودێری باڵاوە

.

٩ی ئۆگۆستی ٩٨ (٢١ ئابی ١٨٨١)

**موحەمەد حیلمی**

**Y.A. Res 17\53**

**ساحێبی دەوڵەت:**

ئاشکرایە لە لای دەوڵەت و پێشتر بە مێژووی ٧ی شەوالی ساڵی ٩٩ ئەوەمان خستۆتە ڕوو، بە بڕینەوەی مووچەیەکی مانگانەی چوار هەزار و پێنج سەد قروشی بۆ شێخ عوبێدیلا ئەفەندی بەم دواییە لە ماوەی مانەوەی لێرە بۆی دیاری کرابوو، کەدەگەیشتە پێنج هەزار قروش، لەدوای حیسابکردنی ئەوەی تا ئێستا نەدراوە بە هۆی هەڵاتنییەوە، لەبیرخەرەوەی چاودێری ناوخۆی بەرێزدا بەم دواییە کە هاوپێچی موقامی باڵا کراوە هاتووە، لە ماوەی گەیشتنی ناوبراو بە خانەی سەعادەت لە ڕابردوو ئیرادەی سوننی بڕیاری دەرکرد لە شوێنێکی گونجاو نیشتەجێ بکرێن و ژیان و ئاسایش و خەرجی بۆ دابین بکرێت، بە سەرپەرشتیی فەرمانبەرێکی دیاریکراو سەد و حەوت هەزار و دوو سەد و بیست و دوو قروش و نیوی بۆ خەرج کراوە، لە ماوەی چواردەی تەمووزی ساڵی ٩٧ هەتا کۆتایی شوباتی ساڵی دوایی، ئەوە بۆ بەکرێگرتنی خانوو، مووچەی کرێکار و خزمەتکار و خواردەمەنی و ڕایەخ و هەموو پێویستییەکانی دی، داوام لەچاودێری

دارایــی کــرد ئــەم مووچــانە لەســەر نــاوخۆ حیســاب بکــات، ئــەوەی لــە دەفتــەر و سەنەداتەکاندا هاتووە لە لایەن شوورای داراییەوە وردبینی و پشتگیری کراوە کە دەکاتە بیست و چوار هەزار قروش لەشێوەی زێڕ و پەنجا هەزار و پێنج ســەد و حــەفتاو هەشت قروش و پێنج باڕ لەسەر شێوەی مەجیدیەی زیوی بووە، سی هەزار و پێنج سەد و سی و پێنج و دە باڕات بە شێوەی موسەدەسە (یان سوداسی) (شەش یەك!) بــووە، ڕووخســەتم لە ژمێریاری نەزارەت وەرگرت لە مووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات، بەپێی ئــەوەی میوانی ئەو ساڵە لەگەڵ خەرجی گونجاو نەبووە، ئەو بیرخەرەوەیــەم ئامــادە کــردووە بــۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی باڵا لە حاڵەتی دەرچوونییەوە ڕەوانەکردنی بــۆ چــاودێری نــاوبراو هەتا ڕێوشوێنی پێویست لەسەر ئەو بنەڕتەی هەستی پێدەکرێت بگیرێتە بەر.

٦ی **ذی الحجة** ساڵی ٩٩ و ٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٨ (١٩ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٢) سەعــــید پاشـــــا

## Y.A.Res. 17/ 53

**بۆ مەقامی نەزارەتی باڵا:**

لەبیرخەرەوەکەی ئەم دواییەی چاودێری ناوخۆی بەڕێز کە خراوەتە بــەردەم مــەقامی باڵا هاتووە، لە پێشتر و کاتی گەیشتنی ناوبراو بە خانەی سەعادەت، ئــیرادەی ســوننی بڕیاری دەرکــردووە بــە نیشــتەجێکردنی لــە شــوێنی گونجــا و و دابینکردنــی بــژێوی و خەرخییەکەیان بە سەرپەرشتیی فەرمانبەرێکی دیاریکراو، دوایی سەد و حەوت هەزار و سەد و بیست و دوو قروش و نیوێکی لە مــاوەی چــواردەی تــەمووزی ســاڵی ٩٧ هــەتا کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی دوایی بۆ خەرج کراوە، بە کرێ خانوو و مووچەی کرێکــار و خزمەتکار و خواردن و ڕایەخ و هەموو پێویستییەکانی دی، داوام لە نەزارەتی دارایی کرد لەسەر مووچەی ناوخۆ حیسابی بۆ بکات، ئەوەی لەدەفتەر و سەنەداتەکاندا هاتووە لە لایەن شوورای داراییەوە وردبینی و پشتگیری کراوە کە دەکاتە بیست و چوار هــەزار قروش لە شێوەی زێڕ و پەنجا هەزار و پێنج سەد و حەفتا و هەشت قروش و پێنج بــاڕات لەسەر شێوەی مەجیدییەی زیوی بووە، سی هەزار و پێنج سەد و سی و پێــنج و دە بــاڕ

به شێوەی موسەدەسە (یان سوداسی) بووە، ڕووخسەتم لە ژمێریاری نـەزارەت وەرگـرت کە لەپەڕاوێزی بیرخەرەوەکەدا هاتووە لە مووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات، بـەپێی ئەوەی میوانی ئەو ساڵە بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی ناوبراو مووچەی دیـاری کـراو بەشـی نەکردووە، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٢١ی **ذي القعدة** ساڵی ٢٩٩ و ٢١ ئەیلوول ٢٩٨ (٣ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٢)

مەحمود پاشـــــــــــا

## Y.A.Res. 1297. 11.9-848

هاوپێچ و برووسکەی هاتووی موشیرییەی بەڕێز لەشکری چوارەم خرایە ڕوو لەسەر ئەوەی فەرمانـدە و موتەسـەریفی هـەکاری هەسـتی پێکـردووە، لەسـەر جووڵانـەوە و ئامادەکاریی شێخ عوبێدیلا ئەفەندی بۆ هێرشـکردنە سـەر لایـەنی ئێرانـی، هـەروەها دوێنێ ویلایـەتی وان لـە باڵوێزخانـەی سـوننیی تارانـەوە ئاگـاداری پێگەیشـتووە کـە دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە شێوەیەکی فەرمی داوای قەدەغەکردنی دەستدرێژی کوردەکانی سەر بەشێخ عوبێدیلا و سەرکۆنەکردنی دەکەن کە لە لای ئێمەوە هێـرش دەکەنـە سـەر ئەوان، گرتنەبەری ڕێوشوێن لەو بارەیەوە بە بۆچوونی موشیرییەی ناوبراو ئەوەیە کە لای مەقامی باڵاتان ڕوونە کە ئەندازەیەك پارە و خۆراك پێویستە ڕەوانەی ئـەوێ بکـرێ بـۆ ئامادەکردنی سەرباز هەتا ڕەوانەی ئەو شوێنە بکرێ بۆ ئەوەی لەلای ئێمـەوە هۆزەکـان نەپەڕنەوە بۆ ئێران و پارێزگاری لە ئاسایشـی سـنوور بکرێـت، سـەرەڕای ئـەوە ئەگـەر فەرمان دەرچوو ئەحکامی عورفی (باری نائاسایی) ڕابگەیەنرێت، لەسەر ئەوەی پێوەندی بە پارە و خۆراکەوە هەیە نەزارەتی دارایی ئاگادار بکرێتەوە، قسە لەسەر ئـەوە نـەماوە پێویستە ڕێوشوێنی بەپەلە بگیرێتە بەر لـە لایـەن حکوومـەتی سـوننییەوە هـەتا لـەو ماوەیـەدا قـەیرانی سـنوور لەگـەڵ ئێـران سـەرهەڵنەدا، شـێخی نـاوبراویش دەبێـت جووڵانـەوەکانی لەسـەر ڕاسـپاردە و ئامۆژگارییـەکانی یـاوەران (راوێـژکار- نووسـەر) حەزرەتی مەولانا سوڵتان ڕێك بخات کە بەڕێوەیـە، بـەڵام هەواڵـەکان دەڵـێن چـەکدارە کوردەکان و خێڵەکانی لای ئێمە کۆ دەبنـەوە، لـەو حاڵەتـەی ئەگـەر هۆزەکـانی ئێـران

پەڕینەوە بۆ لای ئێمە، پێویستە ڕێوشوێنی بەهێز بگرینە بەر بۆ پاراستنی ئاسایش، بەپێی ئەوەی لە برووسکەدا ڕوون کراوەتەوە بۆ ڕووخسەتی ڕاگەیاندنی ئەحکامی عورفی ئەگەر پێویستی کرد، ئەو بیرخەرەوەیەم ڕێکخستووە هەتا بۆ ئیرادەی سوننی ڕوون بێت ڕێ بە موشیرییەی ناوبراو بدات لەکاتی پێویست ئەحکامی عورفی ڕابگەیەنێت و سەربازی پێویست بۆ ئەو شوێنانە بەڕێ بکات هەتا پارێزگاری لە ئاسایشی سنوور بکەن و نەیەڵن ئاژاوە سەر هەڵبدات.

**٩ذي القعدة ساڵی ٩٧ و ١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٣١ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠)**

**سەعیـــد پاشـــــا**

## Y.A. Res. 1297.11.9 - 848

**برووسکەی ٣٠ی ئەیلوولی ساڵی ٩٦ (١٢ی تشرینی یەکەمی ١٨٨١)**

**بۆ موشیریەتی بەرێز لەبەڕێوەبەرایەتیی مابینی هەمایوونی:**

لە نامەی فەرماندەی هەکاری دا هاتووە شێخ عوبێدیلا ئەفەندی لە قەزای کوار و دەورووبەری خۆی و لەبەری ئێرانی لەنێوان هەشت تا دە هەزار کەسی کۆ کردۆتەوە بە ئاراستەی سابلاخ و ورمێ هێرشی کردووە کە لە نامەکەی ڕابردوو بۆم ڕوون کردوونەتەوە، هەروەها نامەی بۆ ئێرە و ئەوێ ناردووە بۆ ئەوەی چەکداری زۆر لە کورد و خێڵەکان لە سنووری لای (ئەشتوب)ی تەنیشت شەمدینان کۆ بکاتەوە، هەروەها لەدوای ئاغاکانی سنووری ئێمەی ناردووە هەڵبگەڕێنەوە، عەبدوڵڵا ئاغای سەیدانی و عێزەدین بەگ دانیشتووی ئەلباك هەندێ پیاویان کۆکردۆتەوە و بەخێرایی ڕۆیشتوون، هەروەها خەلیفە سەعید هەراتێ لێرە و لەوێ پیاو کۆ دەکاتەوە، سەرەڕای ئەمە خەڵکی ناحیەی کوێگی سەر بە جولەمێرگ و دانیشتوانی سوارکان و ماسرۆی سەر بەئەلباك نیشانەی یەکگرتنیان لێ بەدیارکەوتووە، دانیشتوانی شوێنەکانی تریش هەتا ئێستا لەڕاوێژکردندان، ئەوەی دیارە شێخ هێرش دەکاتە سەر ئێران و لە عەلی خانی شکاك دەدات کە زیانی لە هۆزەکانی دەڤەری ئێمە داوە، بەڵام قسە هەیە کە ئامانجی بنەڕەتیی دەست بەسەراگرتنی ئەو شوێنەیە، چونکە هیچ ڕێگەیەکی دی نییە پێویستی

بەهێزی سەربازی تەواو هەیە، بیرۆکەی سەرەتا و کۆتـایی خراپـی شـێخ زۆر کارەسـات دروست دەکات، ئەگەر ئێستا چالاکییەکانی لە سنووری ئێرانەوەیە ئەوە شای ئێران بـە ڕێگەی بـاڵوێزی تارانـەوە برووسـکەیەکی لـە مێـژووی ٩ی ئـەیلوولی سـاڵی ٩٦ (١ی نیسانی ١٨٨٠) کە وێنەیەکی بـۆ ویلایـەتی وان نـاردووە و چـاودێری دەرەوەی بـەڕێز گەیشتووە، لەو برووسکەیەکەیەدا هاتووە ئەگەر هێزی سەربازی پێویست نەنێرن بۆ ئێرە بۆ سزادانی خێرای کوردەکانی سەر بە شێخ، هێزە سـەربازییەکانی ئێرانـی ڕوخسـەتیان وەرگرتووە و بە درێژایی سنوور کۆبوونەتەوە بۆ ڕاوەدوونان و سزادانی شـێخی نـاوبراو و لایەنگرانی، ئەگەر بەرژەوەندی وا پێویست بکات لەشکری ئێرانـی بـۆ ڕاوەدوونـان لـە سنوور دەپەڕنەوە بۆ بـەری ئێـرە[١٤] ئـەو کـات بەرپرسـیارەتی دەکەوێتـە سـەر شـانی ویلایەتی وان، پاشماوەکەی دی لە برووسکەی ژمارە ٢دایە.

٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ٩٦ (١١ی نیسانی ١٨٨٠)

سامح

**ژمارە (٢) ژمارەی وشەکان ٢٠٠**

**:بۆ موشیرییەی مابینی هومایونی**

**:بۆ سەرۆکایەتیی وەزیران**

**:بۆ نەزارەتی جەنگی، بەڕێز**

چونکە شۆڕشگێڕان لەسنووری ئێرانن سزادان و سنوور بۆ دانـانی دەکەوێتـە سـەر لایەنەکەی دی، گرتنە بەری ڕێوشوێنی پیویسـت کـورت دەبێتـەوە لـە قەدەغـەکردنی پەڕینەوەی هۆزەکان بۆ لایەنی تر و پاراستنی ئاسایشی سنوورەکانمان، بـە ئـەو شـالاوە گەورەی ئێران شۆڕشگێڕان دەشکێن، لەو حاڵەتە دەپەڕنەوە بۆ سنووری ئێمە و بە هـۆی ئەو پێگە زۆرەی شێخ هەیەتی هەر بانگەوازێکی ئەو لێرە دەبێتە پشێوی نێو هۆزەکانی

(١٤) هەروەك لە بەڵگەنامەکانی کاروباری دەرەوەی ئێرانیشدا هاتووە، بە هاوکاریی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی داوای دورخستنەوەی شێخ لەسەر سنوور دەکەن، لەپێناو پاراستنی ئاسایشی هەر دوو دەوڵـەت و هێنانـەدیی یەکێتیی ڕاستەقینەی نێوانیان، بگەڕێوە، علی ئەکبەر سەرهەنگ، شێخ عوبێدیلای نەهری لە بەڵگەنامەکانی کاروباری دەرەوەی ئێراندا، و.محەمەدی حەمە باقی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٩. و.

سنووری ئێمە، ئەمەش خوانەخواستە دەبێتە کێشەی گەورە بۆ وڵاتەکەمان، ئێستاش هێزی تەواومان دەوێت بۆ بەربەستکردنی، سەرەڕای ئەوە چارەسەری بەپیرەوەچوونی خەڵکی سنووری ئێمە بۆ ئەفکاری شێخیش چارەسەر بکرێت، ئەوە بەزیادکردنی هێزی سەربازی بۆ بەرەی ڕەواندز و هەکاری، لە وەڵامی ئەوە ئەمڕۆ تابورێك بەدوو تۆپی شاخی بە فەرماندەی میر ئالآی عەلی شەفیق بەگ ڕەوانە کرا، هەروەها بە خێرایی موسا پاشای فەرماندەی تیپی هەشت بەدوو تابورەوە لە موشەوە بەڕێکەوت، ئەمە سەرەڕای تابورێکی لەشکری سوڵتانی لەو دەڤەرە، هەروەها لە ناوەند داوامان لە تابورێکی لەشکر کردووە، داواشمان کردووە لە ناوەند کەتیبەی پیادەی سەر بەتیپی حەوت بەخێرایی خۆی ئامادە بکات بۆ کاتی پێویست، هەروەها جەختمان کردە سەر فەرماندەی شارەزوور هێزی تەواو لە ڕەواندز خڕ بکاتەوە، بە فەزڵی حەزرەتی سوڵتان هەموو ڕێوشوێنێك گیراوەتە بەر بۆ پاراستنی ئاسایش و ڕژێم، نەزارەتی دارایی بەڕێزم ئاگاداری کردەوە دارایی وان باری قورسە و ناتوانێت دەیەکی پێویستییەکانی ئەو شوێنانە دابین بکات، لەم حاڵەتە کارەکان گران بوون، داوامان کرد هەوڵ بدرێت بۆ دابیکردنی ئەندازەیەکی پێویست، بەخێرایی کۆمەك لە هەردوو ویلایەتی وان و بەدلیس کۆبکرێتەوە و بگەیەنرێت، ڕوخسەتیش هەبێت بەپێی ڕێنومایی تایبەت ئەگەر پێویستی کرد لەبەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەگەرەکان ئەحکامی عورفی ڕابگەیەنرێت .

٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ٩٦ (١١ی نیسانی ١٨٨٠)

سامح

**Y.A .Res/ 2259**

**چاودێری دارایی ــ قەڵەمی نامەکان:**

نووسراوی لە ویلایەتی هەکاری بەڕێزەوە بە ژمـارەی (٢٠٠) لـە ڕێکـەوتی ٢٤ی ئازاری ساڵی ٩٨ (٥ی نیسانی ١٨٨٢) بۆ چاودێریی دارایی و لەوێ بـۆ خەزێنـەی بـاڵا ڕەوانە کراوە و هاتووە، کە مووچەی مانگانەی دیاریکراو بە شێوەیەکی کاتی بـۆ شـێخ عوبێدیلا ئەفەندی شێخی زاویەی شێخ تەها لە ناحیەی شەمدینان کە هەمووی دەکاتـە چوار هەزار و پێنج سەد قروشی کەڵەکەبوو، کە حیسابی هەردوو ساڵی نـەوەد و شـەش و، نـەوەد و حەوتــە، شــێخ عەبــدولقادر ئەفەنــدی کــوڕی عەریزەیــەکی داوە و داوای حیسابکردنی سەد و هەشتا هەزار قروشی کردووە، هەندێ لە خزمەکانی شێخی نـاوبراو مووچەی دواکراویان نەداوە بە هۆی دەیەك و میرانەی مەڕ و مـاڵاتی ئـەو سـاڵانە کـە دەکاتە سەد و دوازدە هەزار قروش، مووچەی ناوبراو کاتییە و کەڵەکەبووی دوو سـاڵانە لەگەڵ پاشماوەی دەیەك و مەڕ و ماڵات کە بە مەرج و کۆتوبەند پەسند کراوە، ویلایەت داوا دەکات چی بکرێ ڕابگەیەنرێت، لە پەراوێزی بیرخەرەوە خراوەتـە ڕوو بـە مێـژووی ١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٥ کە سەیدی ناوبراو و هەندێ لە پیاو و خزمەکانی بـە ئەندازەی پێنج هەزار قروش و نیو وەردەگـرن بـۆ بـەجێهێنانی مەسـەلەی جـەنگ کـە بەرانبەر ئەوە خزمەتی جەنگی پێشکەش دەکەن، لەگەڵ کۆتاییهاتنی مەسەلەی جـەنگ دەبێت ئەو مووچەیە ببڕێت، هەروەها لە وەڵامی نەزارەتی بـەڕێزدا کـە لـە ڕۆژی ١١ی کانوونی دووەمدا نووسراوە فەرمان کراوە هەتا ماوەیەکی تریش ئەو مووچەیە بدرێت.

لەم ڕێنمایانەی دوایی هاتووە کە پێشتر بە درێژایی مانەوەی لە خانەی سـەعادە بـە شێوەی کاتی لە خەزێنە پێنج هەزار قروش بۆ سەیدی نـاوبراو بڕاوەتـەوە، ئـەو مووچـە دیاریکراوە لە مێژووی ڕێنماییەوە لە شەشی ئازاری ساڵی ٩٨ەوە دەدرێت، مووچەیەکە لەبنەڕەتەوە کاتییە و بە ئاگاداریی محەلی هاتووە و لە کۆتایی ساڵی نەوەد و پێنج تەواو دەبێت، بەڵام لە هەردوو ساڵی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت تەواو نابێت، چونکە لـە دوای ئەوە هێچ ئیرادەیەك نییە، ڕێکخستنەوەی مووچەی ناوبراو لەگەڵ پاشماوەی دەیەك و مووچەی ئەو دوو سالەحیساب دەکرێت بە ڕەزامەنـدیی ئـیرادەی نـەزارەتی بـاڵا، بـۆ ئەمەش بەڕێوەبەرایەتیی خەرجییە گشتییەکان و بەڕێوەبەرایەتیی ڕاوێژکاری دارایی لـە

سەریان نووسیوە بۆ مەقامی باڵا هەتا چی لەسەر ئێمەیە ئەنجامی بدەین، فەرمانیش بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

١٦ی ڕەمەزانی ساڵی ٢٩٩ و ١٩ی تەمووزی ساڵی ٩٨ (٣١ تەمووزی ١٨٨٢)

مـــونـیـر

**Y.A Res/1238-21-H-2/0**

لە ڕاپۆرتی سەفارەتی ئێراندا هاتووە شۆڕش و هەڵگەڕانەوە لە سنوورەکانی ئێران ڕووی داوە، سەرچاوەی ئەو هاندانە هەریەك لە شێخ عوبێدیلا و هەمزاغایە[١٥]، لەسەرمانە سەرکۆنە و ئاگاداری ئەو هۆزە کوردانەی لای خۆمان بکەین کە سنووری ئێرانیان بەزاندووە، هەروەکو شای ئێران باڵوێزخانەی ئێمەی لە تاران بە زارەکی لەداواکاری لەو جۆرە ئاگادار کردۆتەوە، ئاگاداری سەرەتا و کۆتایین کە پابەندین بە پاراستنی سنوور، بەڵام ئەوەی پێوەندی هەیە بە سەرکۆنەی ئەو لایەنگرانەی سەڵتەنەی سوننی سنوور دەبەزێنن لە مێژە هۆزە ئێرانییەکان زوڵم و دەستدرێژیان کردۆتە سەر خەڵکی دەڤەری ئێمە، دەبێت چارەسەری بکەین و بەهەمان شێوە بەرپەرچی بدەینەوە، ئەگەر بیستمان هۆزەکانی دەڤەری ئێمە زیانیان بە لایەکەی دی گەیاندووە، ئەوە لیژنەیەکی تایبەت بۆ لێکۆڵینەوە و گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو دەنێرین هەتا حاڵەتی لەو جۆرە ڕوو نەداتەوە، چاودێری دەرەوە بە بڕیاری ئەنجوومەن باڵوێزخانەی ئێرانی ئاگادار کردۆتەوە کە ڕێوشوێنی پێویست گیراوەتە بەر بۆ بەربەستکردنی لایەنگرانی دەوڵەتی عوسمانی، کە زیان و خەسارەت بە دەڤەری ئێران دەگەیەنن، لە ئاکامی ئەو

(١٥)هەروەك لە بەڵگەنامەیەکی قاجاریشدا هاتووە هەمزاغا کەتۆتە ژێر باری شێخ عوبێدیلا و دەستی بە جووڵە کردووە، لە لایەن شێخەوە وەکو سوپاسالار دەستنیشان کراوە، بڕوانە: علی ئەکبر سەرهەنگ، شۆرشی شێخ عبیداللەی نهری لە بەڵگەنامەکانی قاجاریدا، و. محەمەد حەمە باقی، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٧، ل٣٦؛ شازادە نادر میرزای قاجار، ڕاپەرینی شێخ عبیداللەی نەهری و هەمزاغای مەنگور، .محەممەد ئەمین بیژەنی، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ڕۆژهەلاّت، چاپی یەکەم، ١٣٨٩هەتاوی. و.

گۆڕانانەی بە هۆی شەڕەکانی ڕابردوو ڕووی داوە بایەخدان بە سنووری لای دەوڵەتی عیللی زیادی کردووە، سەرەڕای ئەوە هەردوو ویلایەتی وان و هەکاری کورد و خێڵەکان و زۆرێکی ئەرمەنی تیا کۆبۆتەوە، ئەمە وای کردووە سنووردانان بۆ شێخی ناوبراو و هی وەکو ئەو لە بەکارهێنانی پێگەی خۆیان لەنێو خێڵەکان ئەستەم بێت، بەجۆرێ ئەمە لەگەڵ بارودۆخی ئەو ناوچانە و بەرژەوەندی و سوودی دەوڵەت ناگونجێت، کێشەی وادەنێتەوە زۆر جێی بایەخ بێت، باڵوێزی ئێرانی فاکتەر و هەڵچوونی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوەی بە هاندانی شێخ زانیوە، ئەگەر لەسەر سنوور دوور نەخرێتەوە هیوایەك بۆ ئارامی و زەمانەتێك بۆ ئاشایش نامێنێت، دەوڵەت هیوا بڕاو دەبێت لە هاوکاریی دەوڵەتی عیللی و ناچار دەبێت بە دوای چارەسەردا بگەڕێت، ئەویش داوای یارمەتییە لە دەوڵەتی ڕووسی، هەروەکو ناوەرۆکی برووسکەی موشیرییە لەشکری چوارەمی هومایونی بۆ نەزارەتی جەنگ و هی ویلایەتی وان بۆ بابی عالی باسی خڕبوونەوەی هێزەکانی ڕووسی لە نەخچەجەوان و ناوچە سنوورییەکان تیا هاتووە و خراوەتەڕوو، ئەمەش جێی بەئاگاهێنانەوە و هەڵوێستە لەسەرکردنە.

ناردنی لەشکری ڕووسی بۆ سنووری ئێران بۆ پاراستنی سنوور لە ڕووکەشا ئەگەر پێویستی کرد یارمەتیدانی ئێرانە، لەڕاستیدا ئەوە ئامانجی تێکدانی پێوەندی نێوان ئێران و دەوڵەتی عیللیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەیپارێزین و زیان بەدەوڵەت دەگەیەنێت، بە ڕوونی دیارە سەبارەت بە ئێمە لە ئێستا و ئایندە مەترسی گەورە هەیە، هەندێ باڵوێزی دەوڵەتی بێلایەن لەو بارەیەوە ئامۆژگارییان کردووین و جەختیان کردووە بە زوویی پێویستە ئەگەر توانا هەبێت ڕێوشوێن بگیرێتە بەر، ئەمەی ئێستا مەسەلەیەکی تایبەت بە سکاڵای ئێرانییەکانە، دیارە لە بەدواداچوون لە مەسەلەکە کەم ناکاتەوە، بەرژەوەندی وا دەخوازێ لیژنەی بەدواداچوون پێك بهێنرێت و ڕەوانەی ناوچەکە بکرێت، دوایی چۆن پێویست بێت کاری بۆ بکرێت، سەرەڕای ئەوە ئێرانییەکان ئاگادار بکرێنەوە کە دەوڵەتی عیللی ئەم بابەتەی بە بایەخەوە وەرگرتووە، ئەگەر نا ئێرانییەکان بەلای ڕووسیا مەیل دەکەن، بە قسەی باڵوێزی ئێرانییەوە ئەمە دیار بوو کە هەتا ئێستا لیژنەی بەدواداچوون نەنێردراوە، بۆیە بەخێرایی جەخت دەکەمەوە لەسەر هەڵبژاردنی لیژنە و ناردنی هەتا پاڵپشتی قسەکەمان بێت، حەیدەر ئەفەندی چاودێری برووسکەی

پێشوو دوو جار له پلەی باڵوێزی تاراندا بووه و ئاگاداری بارودۆخەکەیە، بەتەواوی لـەو وڵاتە گەڕاوەتەوە، توانای باشی هەیە لە ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکـە، کەسـێکی دی یـاوەری بێت لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی جەنگ وەکو کۆمیسترا یان نێردە (پایەیەکی نێزیکـە لـە سکرتێر. و.) ئاماژەی بۆ بکرێت، کەمال ئەفەندی کە دوێنێ بە موتەسـەڕیفی عـەمارە دامەزراوە کۆمیسترای دووەم بێت، ئەرکی بەدواداچوونیان بخرێتە ئەستۆ، ئەگـەر وەکـو دەڵێن دەستدرێژی لە سنووری ئێرانـی هـەبوو پەلـە لـە نەهێشـتنی بکرێـت و هـەموو ڕێوشوێنی پێویست بگرنە بەر، ئـەوراقی سـکالآیان بـدرێتێ و بـەزوویی بۆیـان ڕەوانـە بکرێت، هەروەها بڕیار بێت ئەو دوانە مووچەی مـەئمووری پشـکنەری یەکـەم و دووەم وەربگـرن، ئەوانـەی دەنێـردرێن بـۆ دەڤـەری ئـەنادۆڵ مووچـەیان بـدرێتێ لەگـەڵ پێویستییەکانی سەفەر و خەرجی نائاسایی... لە هەموو حاڵەتێك فەرمان بۆ حـەزرەتی گەورەمان وەلی ئەمرە.

## سەفەری ساڵی ٩٨ و ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٢ی کانوونی دووەمی ١٨٨١)
## مۆری ئەندامانی ئەنجوومەنی بریکارەکان

**بەڕێوەبەرایەتیی چاودێری جەنگی:**

وەڵامی برووسکەی هاتوو بۆ مەقامی پایەدارتان بەرز دەکەینەوە کە لە دەوڵەت نافیز پاشا موشیرییەی لەشکری هومایونیی چوارەمەوە هاتووە و لەو دەڤەرەن کە زانیاری شابەندەری تەورێزی تیایە بەوەی دەوڵەتی ڕووسیا لەشکری بۆ نەخجەوان و سنوور ڕەوانە کردووە، هۆی ئەمە و ئەندازەی سەربازان.... فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە

٢٤ی موحەڕەمی ساڵی٩٨ و ١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی٢٩٦ (٢ی کانوونی دووەمی ١٨٨١)

## وەڵامی ئەو برووسکەی کە لە ڕێکەوتی ١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦ (١ی کانوونی دووەمی ١٨٨١) بۆچاودێری جەنگی هاتووە:

لە موحەمەد نافیز پاشا موشیرییەی لەشکری چوارەمی هومایونی لە وان :

لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی هەواڵی ناردنی هێزی گەورەی سەربازی دەوڵەتی ڕووسیا بۆ نەخجەوان و سەر سنوور پرسیارم لە کونسوڵی جێگیری ئەو دەوڵەتە کرد لە تەورێز لەسەر هۆی ناردنی ئەو هێزە، وەڵامی دامەوە بۆ پاراستنی سنوورە، لە نامەی شابەندەرییەی تەورێز بە ڕێکەوتی ٢٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ٩٦ ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە لە دوای دواسۆراغ و گوێبیستن دەرکەوتووە ئەو هێزە بریتییە لە چواردە تابوور و دوو بەتارییەتی تۆپ، تکایە بەدواداچوون.

## بەڕێوەبەری سەرۆکایەتیی وەزیران ــ ژووری برووسکەکان

وەڵامی برووسکەی هاتوو بۆ مەقامی سەدارەتی سامی لە ویلایەتی وانەوە:

شابەندەری تەورێز بە ڕێکەوتی ٢٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ٩٦ لە نامەیەکدا ئاگاداری کردین کە بە هۆی بەدواداچوون و گوێبیستی ئەم دواییە دەرکەوتووە ڕووسیا هێزێکی سەربازیی گەورەی ناردووە بۆ نەخجەوان و سەر سنوور، لە وەڵامی پرسیارێك کونسوڵی ڕووسی لە تەورێز لەسەر هۆکاری ئەو هێزە وتی بۆ پاراستنی سنوور هاتووە و بریتییە لە چواردە تابوور و دوو تیپی تۆپ.

١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦

حەسەن

کۆنووسی ئامادەکراو و پاشبەندەکانی لە لایەن ئەنجوومەنی بریکارەکان لەسەر بەدواداچوون و توێژینەوە لە سکاڵای دەوڵەتی ئێران بۆتان بەرز دەکەینەوە، لەسەر جووڵانەوە و کاری یاخیگەرایی و هەڵگەڕانەوە بە هاندانی شێخ عوبێدیلا و لایەنگرانی، نازیری ڕابردووی پۆستە حەیدەر ئەفەندی و کەمال ئەفەندی موتەسەریفی عەمارە بە سیفەتی کۆمیسیری یەکەم و دووەم بە یاوەریی پیاوێکی شایستە لە بەڕێوەبەرایەتیی سەربازی دانران بچن بۆ بەدواداچوون، ئەگەر لای ئێمەوە بە واقیع سنوور بەزاندن هەبوو

نەیهێڵن، لەگەڵ ئەوەی پەیوەستە بەو کارەوە، ئەم ڕوونکردنەوەیەمان دەرکرد بۆ جێبەجێکردنی ئیرادەی سوننی بەڕێز لەو بارەیەوە.

سەفەری ساڵی ٩٨ و ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٢ی کانوونی یەکەمی ١٨٨١)

سـەعید

## Y.A. Res 1297-12-7
## H-2053

وێنەی بیرخەرەوەی نەزارەت:

بایەخی ستراتیژیی دەڤەری وان و هەکاری لای موقامی باڵاتان شاراوە نییە، ئەم بایەخە بە هۆی ئەو گرژییەی ئێستا لە ئێران هەیە زۆر زیادی کردووە، زۆر پێویستە سوور بوون لەسەر ئاسایش و دڵنیایی لەو ناوچانە و ڕێگرتن لە سنووربەزاندن و ئاژاوەی هۆزە کوردەکان لە مومتەلەکاتی ئێرانی لە سنووری خانەقین، چونکە دەوڵەت لە ئاستی پێویستدا نییە، موشیرییەی لەشکری چوارەمی هومایونی بە هۆی بایەخی ئەو ئەرکە لەگەڵ نەزارەتی جەنگی بەڕێز بە گونجاوی دەبینین سەرۆکی ئەرکان سەعادەتی فەریق نافیز پاشا موشیرییەی لەشکری هومایونی ناوبراو بە ڕەزامەندیی مەقامی باڵا بۆ ئەم ئەرکە دابنرێت، ئەم بیرخەرەوەمان دەرکرد بۆ جێبەجێکردنی ئیرادەی سوننی بەڕێز لەو بارەیەوە.

**٧ی ذي الحجةي ساڵی ٩٧ و، ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٦ (١٠ی تشرینی دووەمی ١٨٨٠)**

**وێنەکە وەکو خۆی**

## Irade Dahiliye
## 69691

ئیرادەی سوننی سوڵتانی نووسراوێکی هومایونی دەرکردووە لەسەر ڕەزامەندی بۆ کامیل بەگ بۆ ئەرکێکی تایبەتی لە وان کە حەسەن ئەفەندی ئەندامی ئەنجوومەنی ئیدارەی ویلایەتی وان بە جیاکەرەوەی پلە دوو، ئەحمەد ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی شەمانس بە پلە سێ بکرێتە قائمقامی قەزای کوار، عوسمان ئاغا یوزباشی زەبتییەی

پیادە لە ویلایەتی وان و سامی مەجیدییە پلە پێنجی بدرێتێ و بگوازرێتەوە بۆ موسڵ بۆ فەرماندەی یەکەی سوارە، کەتیبەی زەبتی وان چونکە یاوەری شێخ عوبێدیلا ئەفەندی دەکات لە کاتی گواستنەوەی بۆ موسڵ و بۆ خزمەتی باش و ئەمەکداری لەگەڵیدا، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

١٩ی سەفەری ساڵی ٣٠٠ و ١٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٨ (٣٠کانوونی یەکەمی سالی ١٨٨٢)

عەلی ڕەزا

## /Y.MTV.114/3

**برووسکە**

**لە دەروێش پاشا یاوەری بەڕێز بۆ گەورەمان سوڵتان:**

بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە زانیومە کە هەندێ لە خراپەکاران وایان لێ کردووم وەك ئامانجێك بە کارم بهێنن بۆ برەودان بە مەبەستەکانیان، من دڵنیات دەکەمەوە و سوێند دەخۆم کە من لەسەر پەیمان و بەڵێنی خۆم بەردەوامم لە پشتگیریکردنی خەلافەتی بەڕێزتان لە (ئەستانە) و، ئەو شتە هەڵبەستراوانە هەموویان لە ئەنجامی ڕق و کینە و بەخیلییەوەن، من ئامادەم بە جێبەجێکردنی هەر بڕیارێك کە لە دەسەلاتی سوننییەوە دەربچێت و، ئامادەم خۆم هەموو ئەندامانی ماڵەوە و خانەوادەکەم بکەم بە قوربانی لە ڕێی بەڕێزتاندا و، هەروەها سوێند دەخۆم کە هەمو کاتێك ئامادەم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستیانە بە تێر و تەسەلی.

**٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣١٠**

**حافز مەحمود**

## (بەڵگەنامەکان لەسەر جووڵانەوەی بەدرخان بەگ)

**Irade Mesail –I Muhimme 1235**

**دەرخستەیەك لە منی بێدەسەڵاتەوە بۆ مەقامی چاودێری باڵا:**

پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە لای بەڕێزتان، پێش ئەوەی کۆتایی بەو بارگرژی و هاتوهووتە بهێنرێت کە لەو ناوچانەدا ڕووی دا، سێ لە کەسە ناودارەکانی ئەو ناوچەیە بانگ کران و بۆیان دەرکەوت ئەوە لە دەسەڵاتی سوننییەوە دەرنەچووە و، ڕوونم کردەوە لە دوونامەکەی کە پێشتر بۆ بەڕێزتانم ناردن کە ئەوان هەمان شت دووبارە دەکەنەوە وەك شێوەی پێشوو لەگەڵ بەڵێندانیان بە ناردنی هەندێ کەسی ناودار بۆ لامان کە لە ناویاندا خەڵکی شەرعزان و خەڵکی ئاسایی ناوچەکەی تێدابوو بە سوور بوون لەسەر جێبەجێکردنی خواستی سوننییەکان لە ماوەی چل ڕۆژدا کە لە ڕۆژی (٢٠)ی **ذی الحجةوە** دەست پێدەکات.

وە بیست ڕۆژ بەسەر نامەکانمدا ڕۆیشتن هەتا ئێستا هیچ وەڵامێکیان نەبوو کە دەرکەوت ئەو خەڵکە گوێڕایەڵییان نییە، بۆیە شایەنی ئەوەن سزا بدرێن و، داوا لە بەڕێزتان دەکەن بە فەرمانکردن بەوەی کە پێویستە بکرێت.

ئەو نامەیەی کە وەك وەڵامی دوو نامەکەی من هاتووە دەیخەمە بەردەستتان لە گەڵ بڵاوکردنەوەی ئەوەی کە پێشتر دەیانکرد، لەسەر سوربوون لە سەرپێچی و بەردەوام دەبن لەسەری، ئەمەش وامان لێدەکات کە جەخت لەسەر تەمێکردنیان بکەینەوە و، دواکەوتن لە جێبەجێکردنی ئەوەی کە پێویستە بکرێت، دەبێتە هۆی تەشەنەکردنی ئەو بارودۆخە لە شوێنەکانی دیش و، لە بەرژەوەندیی بارودۆخەکەدایە کە بەڕێزتان فەرمانێك دەرکەن بە جێبەجێکردنی ئەوەی کە لە یاداشتنامەکەدا هاتووە... فەمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٨ی شەعبانی ساڵی ٤٢

فەماندەی ئەرزڕۆم: ئەسعەد پاشا

**دەرخستەکەی منی بێدەسلات بۆ بەڕێزتان:**

شاراوە نییە لای بەڕێزتان کە لە ڕێگەی لابردن و نەهێشتنی ئەو گرفتەی کە ماوەیەك پێش ئێستا لە نێوان خەڵکی (وان) و قەزاکاندا ڕووی دا، هیچ کەمتەرخەمیم لە کارەکەمدا نەکردووە، لە ئامۆژگاری و ترساندن، بەڵام مستەفا بەگ کە خەڵکی (وان) بوو و، خان مەحمود و نوورەڵا بەگ ئەمیری هەکاری و کەسانی تریش کە ناوەکانیان ناسراوە ڕێك کەوتبوون لە گەڵ بدرخان بەگ لە سەر سەرپێچیکردنی دەسەڵاتی سوننی، ئەوانە ئامۆژگاری بە هیچ شێوەیك کاریان تێ ناکات و، شتێکی ڕوونە ئەوان دەرچوون لە گوێڕایەڵیی گەورەکەیان و، گەیشتوونەتە چڵەپۆپە لە سەرپێچیکردندا، بۆیە بە پێی یاسا شایەنی سزادانن و، ئەگەر نەتوانرێت هێزی زۆرەملێ لە دژیان بەکار بهێنرێت بۆ گێڕانەوەیان بۆ بازنەی گوێڕایەڵی و ملکەچی، بە ئامۆژگاری کارێکی چاوەڕوان نەکراوە و، هەروەها لێبوردنیان یان دواکەوتن لە تەمێکردنیان سەردەکێشێ بۆ زەرەر و خراپەیەکی زۆر لەو ناوچانەدا، بەڵکو بڵاو دەبێتەوە لە ناوچەکانی تریشدا.

وە بە تێڕوانینی ئەوەی بەکارهێنانی هێزی زۆرەملێ بە شێوازێکی گونجاو ڕێی تێدەچێت و، ڕوونم کردۆتەوە لەوەی کە بە خەیاڵمدا هاتووە لەو ڕێوشوێنەی کە بەش بەش لەو دوو نووسراوەی کە بۆ پایەبەرزم نارد و، بە هۆی چاوخشاندنی بە ناوەڕۆکی نووسراوەکە (نامەکە)مدا بە گونجاوی نازانم بۆ ئێرە بهێنرێت تا ئەوەی لێرە ڕووی داوە لەوێ دووبارە نەبێتەوە و، ڕێوشوێنی پێویست بگیرێتەبەر هەروەك لە بەیاننامەکەدا هاتووە، یا بە پێی ئەو فەرمانەی کە لەمبارەیەوە لە دەسەڵاتی سوننییەوە دەردەچێت، ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەنجام بدرێت کاری تەمێکردنیانە بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژ بە خەڵکی ناوبراو و بەدرخان بەگ، ئەو کارەش پێویستە لە ئێستاوە کاری بۆ بکرێت، چونکە دواخستنی شتی دی لێ دەکەوێتەوە، تکایە گرینگی بەو فەرمانە بدەن کە لە دەسەڵاتی سوننییەوە دەردەچێت دەربارەی ئەنجامدانی ئەم کارە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا... فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٢٥ی سەفەری ساڵی ٤٢

**((وێنەی ئەو نامەیەی کە لە کونسوڵی ئینگلیزدا لە موسڵەوە هاتووە بۆ سەفارەتی ئینگلیز لە ڕێکەوتی ١٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٨٤٦دا)):**

سەفیری بەڕێزی ئاگادار کردەوە لەوەی کە دەترسێت ئەو دوو(نستورە)ی کە لە قەزای (**طنجـوم**) نیشتەجێبوون ڕووبەڕووی مەترسی ببنەوە، کە ئەو شوێنە سـەر بـە نـوورەڵا بەگ بوو و، پاشان ڕادەستی بەردخانی کـردن، بـەدرخانیش نـاردنی بـۆ کوشـتارگەیەك خراپتر لەوەی کە بۆ مەسیحییەکانی (**تـەیاری**) دروست کرابوو، ئـەو دوو (نسـتورە)یان ئاگادار کردەوە کە دەکەونە نێو ئەو ڕووداوەوە، بەدرخان هیچ دیلێك لە ئێسـتاوە ئـازاد ناکات و منداڵ و پیاو و ژن بە بێ جیاوازی دەکوژێ[(١٦)] ئەو سەرقاڵ بوو بە کۆکردنەوەی سەربازەکانی و دابینکردنی خۆراك بۆیـان، مەسـیحییەکان بەمـە کەوتنـە دڵـەڕاوکێ و ترسێکی زۆرەوە، بە شێوەیەك هەموویان ئامادە بوون بچنە نێو خاکی ئێرانەوە.

لە سەرەتای کارەکەدا ویستیان پارێزگاری لە (**تەیار** پاشا) بکەن و ناردیان بۆ موسڵ لە گەڵ قەشە و ڕاهیب و پیاوێکی دی، بەڵام نەگەیشتنە جـێ، واگومـان دەکرێـت لـە ڕێگادا لەنێوچووبن، یان گەڕابنەوە دوای ئەوەی کە زانیویانە ناوچەی (ڕێکەوتی) دەستی بەسەردا گیراوە، ئەو پیاوە خراپەی کە بە (عەبدولسەمەد بەگ) ناسـرابوو، لـە ڕووداری (**تەیاری**)دا ناوبانگی دەرکردبوو، لە گەڵ کوردەکان هەستا بە سـەربڕینی هـەموو ئـەو (نستور)یانەی کە بە زەوییەکانیاندا بەرەو موسڵ دەچوون، هەر دوێنێ سەد کەسـیان لێ کوشتن، ئەمجارەیان هەموو سەرکردەکان لە ناوچەکەدا ناکۆك بوون کەوا ئەو هێرشەی کە بڕیاردرابوو دژ بە (نستور)یەکان بکرێت زۆر گەورەتر دەبێت لە هێرشی پێشتر، لـە گـەڵ ئەوەشدا سەرکردە کوردەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە (بدرخان بـەگ و نـورەڵا بـەگ و

---

(١٦) بەدرخان پاشا مامەڵەیـەکی زۆر نـەرمونیانی بەرامبـەر مەسـیحییەکان پـەیڕەو کـرد، تائـەو کاتـەی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیـان لـە چوارچـێوەی دەوڵـەتی عوسمانیـدا دەسـتیان لـە کاروباری ئەو دەوڵەتـە وەردا و دژی بـەدرخان کەوتنـە هانـدانی مەسـیحییەکان، ئینجـا ئـەو مـیرە کـوردە هەڵوێستی بەرامبەریان گۆڕی، بڕوانـە: **سـعدی عثمـان هروتـی، کوردسـتان والامبرایـة العثمانیـة، مطبعـة خانی، الطبعـة الاولی، دهـوك، ٢٠٠٨، صـص٢١٣ و ٢١٥؛ جلیلـی جلیـل والاخـرون، الحرکـة الکردیـة فـی العصر الحدیث، ت.عبدی حاجی، دار الرازی، الطبعة الاولی، بیروت، ١٩٩٢، ص٢٠.** و.

عەبدولسەمەد بەگ) لە نێو خۆیاندا نـاكۆك بـوون، هـیچ تێگەیشـتنێك لـە نێوانیانـدا نەبوو، دوو كەس لە نێویاندا كە بە پیاو چاك دادەنران ئەوانیش (شێخ محەمەد موسڵی و شێخ یوسفی زاخۆیی) بوون داوایان لێ كردن كە واز لە كێبـەركێ و نـاكۆكیی نێوانیـان بهێنن و لە گەڵ بەدرخان بەگ یەك بگرن تا مەسیحییەكان لەنێو بەرن و، ئەوان دەتوانن دوای كۆتاییهێنان بەو كارە گرینگە بگەڕێنەوە سەر باری پێشوویان، كاتێ كـە (تـەیار پاشا) بیستی كە عەبدولسەمەد بەگ ئاژاوە و ناكۆكی خستۆتە نێو مەسـیحییەكانەوە، شێخ محەمەدی نارد بۆ (ڕێكەوتی) كە ئامادە بێـت بـۆ ئاشـتەوایی، ئـەم كـارەی شـێخ نارەزایی زۆری لێ كەوتەوە.

كوردەكان هەموو شێوازێكی ستەم و زۆرداریـیـان دژی مەسـیحییەكان ئـەنجام دەدا، هاوكات دەوڵەتی عوسمانی بەڵێنی بە مەسیحییەكان دا لە باج بیانبەخشێت بە هۆی ئەو زەرەر و زیانەی كە لەو ساڵەدا تووشی هاتوون، كە دوو جار سەرانەیان دابوو، جارێك بە بەدرخان بەگ، جـارێكیش بـە نـوورەڵا بـەگ، پاشـان دەسـتدرێژی هـۆزە دڕنـدەكان و دەستدرێژییەكانی جەنگی ڕێكەوتی شوێنەواری خراپی لێ كەوتەوە، كاتێك تەیار پاشـا بەم بارودۆخەی زانی نامەیەكی بە پەلەی نارد بـۆ بـەدرخان بـەگ، فـەرمانی كـرد بـە لابردنی ئەو زوڵم و زۆرییەی كە لە سەر مەسیحییەكان بوو و، ناردی بـۆ ڕێكـەوتی كـە ئەحمـەد بـەگ لـەو فەرمانگەیـە كارمەنـد بـوو بـەوەی كـەوا ئـەو بەرپرسـە لـە هـەر دەستدرێژییەك كە دەكرێتەسەر هەر مەسیحییەك و، فەرمانی كرد بە گەڕانـەوەی شـێخ محەمەد بۆ موسڵ و ئاگاداركردنەوەی لە سـەر هەڵسـوكەوتەكانی و، تونـد بـوو لەسـەر ئەحمەد بەگ كە هەستێت بە بەدواداچوون لە بـارودۆخی گونـدەكان و ئاسـاییكردنەوەی بارودۆخی مەسیحییەكان و خستنە ڕووی كار و بارەكانیان بە بێ ترس، ئـەمڕۆ هـەموو ئەو شوێنانەی كە مەسـیحییەكانی لـێن سـەر بـە هـەكارین، كـە سـەر بـە ویلایـەتی ئەرزرۆمە، بەڵام چەند زنجیرە چیایەكی گەورە لە نێوان لایـەنی باسـكراو و ئەرزەڕۆمـدا هەیە، بۆ ئەوەی كە گەورەترین دوژمنەكانی (نستوریە)كان لـەو چـیایانەدا دەژیـن، بـە هۆی دووری و خراپە ڕێگاوبان لە كاتی شەڕ و دەستدرێژی بۆ سەریان نـاتوانن هانـا بـۆ ئەرزرۆم بەرن، بە پێچەوانەشەوە پێوەندییان لە گەڵ موسـڵدا بەردەوامـە و بـە جۆرێـك دەتوانرێت هـەموو كەلوپەلـەكانیان لـە مـاوەی چـەند ڕۆژێكـدا بگوزارێتـەوە و، والی

موسڵیش دەتوانێت سەرباز و یارمەتییان بە پێی داوای خۆیان بۆ بنێرێت، لە پێناو بەدیهێنانی ئاسایش و مانەوەی (نستوریە)کان دەتوانرێت ناوچەکەیان بە ویلایەتی موسڵەوە بلکێنن.

هەروەها پێویستە عەبدولسەمەد ئەو پیاوانەی لەسەر شێوەی هەڵسوکەوتی هەردوو شێخی ناوبراو دوور بخرێنەوە لەو شوێنە و، نابێت بەدرخان بەگ دەسەڵاتی بەسەر ئەو شوێنانەدا هەبێت، چونکە بەدرخان بەگ بەو هێز و دەسەڵاتەی کە هەیەتی دەوڵەتی عوسمانی لە خشتە بردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ناوبراو دژایەتیی زۆری کراوە، بەڵام ئەگەر ئەو شێخانە (مەبەست لە شێخ محەمەدی موسڵی و شێخ یوسفی زاخۆییە. و.) دوور بخرێنەوە و هۆزەکانی (بنیاشی و مزباری) و هۆزە کوردەکانی دی هاوکاری بکرێن لە لایەن دەوڵەتەوە دەتوانرێت ناوبراو دووربخرێتەوە بۆ ناوچە شاخاوییەکان، هەروەها (نستورییە)کان لە قەزای تنجوم و جیل و باز ڕاهاتوون لەسەر هەڵگرتنی چەك و دەتوانرێت هەزاران کەسیشیان لێ چەکدار بکرێت و بەکار بهێنرێن و، تەیاربەگ مەبەستی بوو هەستێت بە هەڵمەتێك لە دوای جەژن هەتا جزیرە، ئومێد دەکرا کە ژمارەیەکی زۆر سەربازی لە گەڵدا بێت بۆ ئەوەی بەدرخان بەگ نەتوانێت هەستێت بە هیچ کارێك دژ بە(نستورییە)کان یان هاوکاریی خان مەحمود بکات لە کاتێکدا کە تەیار پاشا لە ناوچەکە نەبێت.

## وەرگێڕانی ئەو نامەیەی کە لە کونسوڵی دەوڵەتی ئینگلیزدا لە (ئەرزڕۆم)ەوە هاتووە، لە ٢٥ی شوباتدا:

لە گەڵ ئەو پۆستەدا هەزار کیسە لەو سکە باشە نێردرا بۆ تەواوکردنی مووچەی ئەو سەربازانەی کە پێیان نەدراوە و، دەگوترێت لە پۆستەی داهاتوودا هەزار کیسەی دی لەو سکانە (ئەقجە) دەنێردرێت، ئەو (ئەقجاتا)نەی کە هاتن بە تەواوی دابەش کران کە هەموویان لەو سکە باشە نوێیانە بوون، ئەسعەد پاشا ئەو سکانەی نەگۆڕی هەر لە سەر ڕێوشوێنی کامیل پاشا ڕۆیشت و، هەر وەکو خۆی ناردنی و بەڕێی کردن تا ناوبانگ و شەرەفەمەندیی زیاتر بەدەست بهێنێت.

لە سەر زاری هەندێك كەس دەگوترا كە سێ هەزار و پێنجسەد ئۆقجەی دی لە (سیواس و تەرابزون)ەوە لەسەر بەرێكردن بوون، بە گوێرەی پێشوو بۆمان دەركەوت شێوازی ناردنی سەربازە بەرەو (وان)، هەتا هەندێ لە هەواڵەكان دەڵێن: ئەسعەد پاشا خۆی دەبێتە سەرۆكی ئەو سەربازانە، كەواتە ئەو سوودە چییە كە دەوڵەت چاوەڕوانی دەكات لە بەركارهێنانی پیاوی وا لەم كارەدا، چونكە ئەسعەد پاشا هیچ لە هونەرەكانی جەنگ نازانێت، تەنانەت ناتوانێت سواری وڵاخیش بێت بە هۆی نەخۆشی و بەساڵاچوونییەوە، بە كورتی ئەو پیاوی سەربازی نییە.

وە ئەگەر بگوترێت سوود لە كاری چاكەخوازی و شارەزاییەكەی وەربگرێت، ئەوا هەڵسوكەوتەكانی زۆر دوور بوون لەوەی كە پیاوێكی چاكەخواز بێت، لە گەڵ ئەوەشدا پیرییەكەشی بەسەر بیر و هۆشیشیدا زاڵ ببوو، واتە بیر و هۆشی لاواز بوو، گومانم وایە بەكارهێنانی پیاوی وا لەم شێوەكارانەدا زەرەر و زیانێكی زۆرتری دەبێت و ناتوانرێت بگەین بە ئامانج، بەڵام ئەگەر بەحری پاشا سەربازی تەواوی بدرێتێ و ڕێگەی تەواوی پێ بدرێ، بە هۆی زیرەكی و لێهاتوویی و ئەو شارەزاییەی كە ناوبانگی پێ دەركردووە دەتوانێت بەسەر یاخیبووەكاندا زاڵ بێت و سەربەخۆیی و ئاسایش لە ماوەیەكی كەمدا بەدی بهێنێت و، لەسەر زاری خەڵك دەگوترێت لە كۆشكی پاشایەتییەوە سەرباز دەنێردرێت بۆ گەڵ ئەو سەربازانەی بڕیار دراوە بنێردرێن بۆ ئەنجامدانی كارەكە، ئەو ڕێوشوێنە زۆر گونجاوە، چونكە ناتوانرێت متمانە بە هەموو ئەو سەربازانە بكرێت كە لە ویلایەت ناویان نووسیوە، بۆی هەیە هەندێكیان نەچن.

بڵاوبوونەوە و زیادبوونی هەڵگەڕانەوەكانی (وان) هۆكاری كەمتەرخەمی بووە، ئەگەر ژمارەی ئەو سەربازانەی كە بڕیار بوو بیاننێرن كەمتر بوون لە ژمارەی پێویست، هێزی هەڵگەڕاوەكان هەر بەرەو زیادی دەچێت و، بیر و باوەڕ و ئامادەكارییەكانی بەدرخان بەگ و شەریف بەگ، هەر چۆنێك بێت دڵنیا بووین كە ئەوان هاوپەیمان بوون لە گەڵ چەتە و سەرپێچیكارەكاندا و، هەردووكیان خەڵكیان هەڵدەنا بە نەهێنی و، ئەگەر (خوا نەخواستە) هەرشتێكیان هەر گرفتێك لە ڕیزی سەربازان و لە شێوازی ناردنیان ڕووی دابا، ئەوا هەردوو ناوبراو بە ئاشكرا دەچوونە لای ستەمكارەكان، پشتگوێخستنی ئەو هەڵگەڕانەوانە لە لایەن دەوڵەتەوە دەبێتە هۆی بەڵایەكی گەورە بۆی، بەڵكو وا لە

دەوڵەت دەکا کە زۆر بە نارەحەتی بەسەریاندا زاڵ بێت، لە گەڵ تێچوونی پارەیەکی زۆر لە هەڵمەتەکەدا، پێویستە ئەوەی دەیڵێیت وا تەماشای نەکەی کە جۆرێك بێت لە خەیاڵ، لەبەر ئەوەی بارودۆخ لە ئەرمەنستان و کوردستان و ئەناد‌ۆڵدا بەو شێوەیە نییە کە دەیبینین، چونکە چەندین هۆز و خێڵ هەن ئامادەن بۆ کاری ئاژاوەگێڕی و خراپەکاری.

## ((بەڵگەنامەکان لەسەر موسڵ و سنجار))

### DH.KMS.49-2-/23

**چاودێری جەنگی:**

**بۆ پایەبەرز سەرکردەی سوپای شەشەم، ٥ی ئەیلوولی ساڵی٣٣٤:**

لەسەر داوای بەڕێزتان و پێویستییەکانی فەرمانگەی باری ئاسایی، ئەوەیە کە بە شێوەیەکی خێرا چاو بە هەموو ئەو کارانەدا بخشێنینەوە کە لە دیوانی جەنگدا بە سەرکردەکانی سپاردووە و، دەرکردنی فەرمانی تایبەت لەمبارەیەوە، قسەی پێویست ئەوەیە کە کۆتایی بهێنن بەو کارانەی کە پێوەندیدارن بە (دەستبەسەران) بە پێی یاسا، دواکەوتن لەم کارەش دەبێتە هۆی زەرەر و زوڵم لە مافی ئەو کەسانە و، هەوڵدان بە شێوەیەکی خێرا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە پێویستە، ئەو کەسانە بانگ بکرێن کە پێوەندییان بەم کارەوە هەیە، ئەوەش یەکێکە لە کارە سەرەکییەکانی ڕێکخستن، لەگەڵ ئەوەدا پێویستە ئەو کارانەی کە پێوەندیدارن بە فەرمانگەی باری ئاسایی پێش بخرێت بەسەر کارەکانی دیدا، چونکە ئەو پشتگوێخستنە کە پێی ناسراون و ئێستاش پێی دەناسرێن لە سنووری خۆی دەرچووە، لەبەر ئەوە دەستەی لێکۆڵینەوە لە دیوانی جەنگ داوای ئەو کەسانەی کرد کە پێشتر ناوەکانیان پێشکەش کرابوو، ئینجا بیرخەرەوەیەکی دەرکرد بە دەستبەسەرداگرتنی هەموو ئەو کەسانە، بەڵام هیچ کام لەو کەسانە نەنێران، ئەو گوێ پێنەدانەی فەرمانگەی (دەرك) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو فەرمانگەیە ئەو کەسانە دەپارێزێت و، هەر بە هۆی ئەو پارێزگارییەوە زۆربەی لێکۆڵینەوەکان نەگەیشتنە ئەنجام.

به هۆی بەردەوامی ئەو بارودۆخە و دووبارەبوونەوەی، بۆتە هۆی ئەوەی کە کاروباری فەرمانگەی باری ئاسایی بە تەواوی پەك بخات و ئەگەری ئەوەی هەبوو کار بکاتە سەر ئاسایش و بارودۆخی شار، بۆیە دەرکردنی بڕیاری پێویست لەمبارەیەوە پەیوەستە بە فەرمانی سەرکردەمان.

١٥ی ئەیلوولی ساڵی ٣٣٤
سەرۆکی فەرمانگەی باری جەنگی لە موسڵ
بەکباشی عوسمان زەکی

**چاودێری جەنگی:**

بۆ فەرماندەی سوپای هومایونی شەشەم، ٧ی ئەیلوولی ساڵی ٣٣٤

پێوەندییەك دەردەکەوێت لە مامەڵەی ئەو نووسینانەی کە خرایە ڕوو، دوای ئەوەی کە لە بەڕێوەبەری پۆلیس داوا کرا کە داواکراو ئەحمەدی کوری حەسون دەستگیر بکرێت و، بەندکردن بۆ ماوەی ساڵێك، کە ناوبراو بەپێی سەرژمێری سەر بە فەرمانگەی دەرکە، ئینجا لێکۆڵینەوەمان کرد لە فەرمانگەی ناوبراو و، فەرمانگەکە ڕایگەیاند کە سەر بە ئێمە نییە، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس جارێکی دی جەختیان کردەوە لەسەر ئەوەی کە ناوبراو دەرکییە و بەردەوام خەریکی ڕاییکردنی کارەکانییەتی و ئەوەی کە فەرمانگەی دەرك ڕایگەیاندووە پێچەوانەی ڕاستییە، بە چاو پۆشین لەوەی کە فەرمانگەی دەرك هەستاوە بە تۆمارکردنی کەسێك لە سەرژمێرییەکەیان کە فەرمانی دەستگیرکردنی بەسەردا دراوە، بۆیە وەڵامەکەیان لەسەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی ڕەسمی دەرکی نییە ئەوە تاوانێکی یاساییە، هەروەکو چۆن ئەم بارودۆخە بە زۆر شێوەی جیاواز دووبارە بۆتەوە، تکایە فەرمانێك دەربکەن بە جێبەجێکردنی ڕێوشوێنی یاسایی لەسەر هەموو کەسێك.

٧ی ئەیلوولی ساڵی ٣٤
سەرۆکی دیوانی جەنگ لە موسڵ: عوسمان زەکی

**چاودێری جەنگی:**

بۆ سەرۆکایەتیی دیوانی جەنگ ٤ی ئەیلوولی ساڵی ٣٣٤

گومانی تێدا نییە بە ناردنی هەریەکە لە تاوانباران حسین ئوتراقمی کوڕی عەبدوللەتیف و عەلی کوڕی عارف و ئەحمەدی کوری مراد کە ئەندامی یەکەی دەرەکی بوون لە دەرك و، شاویش ڕەشید سەرۆکی دەستەی دەرك بۆ فەرمانگەکەمان بۆ وەڵامدانەوەیان لەسەر کوشتنی تۆفیقی کوڕی سافی خەڵکی گوندی تەعشیقە، لە گەڵ ئاگادارکردنەوەی سەرۆکی تابوری دەرك بە یاداشتنامەیەك لە ڕێکەوتی ٢٨ی ئاگوستی ساڵی ٣٣٤، بەڵام هیچ یەکێك لەو تاوانبارانەی نەنارد، ئەو سوور بوو لە جێبەجێنەکردنی فەرمانی دەستگیرکردنی تاوانبار حسێن ئوتراقمی کە لە ڕێکەوتی ٦ی تەمووزی ساڵی ٣٣٤دا لە دادوەری لێکۆڵینەوە دەرچوو و نێردرا بۆ فەرمانگەی دەرك، بەڵام دووبارە سەرپێچیی یاسایی کرد و جێبەجێی نەکرد و، دوێنێ شاویش ڕەشید هات بۆ فەرمانگە بە بێ ئەوەی کەسی لە گەڵدا بێت کە یەکێك بوو لە داواکراوان، بەڵام بەپێی یاسا وا پێویست بوو کە لەگەڵ هاوەڵەکانی ئامادەبێت، زۆر جەختیان کردووە لەسەر ئەوەی کە دەبێ هاوەڵەکانی لە گەڵ خۆیدا بهێنێت، بەڵام ڕۆیشت و کەسیشی لە گەڵ خۆی نەبرد.

فەرمانگەی دەرك لەسەر کەمتەرخەمیی خۆی بەردەوام بوو لە هێنانی خەڵك، لەبەر ئەوە کاری ئەو نووسراوانە دوا کەوت، وەکو بەڕێزتان ئاگادارن دەستبەسەرداگرتنی ئەو بەندکراوانە بەردەوام دەبێت، ئەو بەیاننامەمان نووسیوە بە مەبەستی ناردنی ڕەشید شاویش و هاوەڵەکانی کە ناویان لە سەرەوە هاتووە و نووسینەوەی ناوەکانیان لە وەرەقەیەکی هاوپێچ لە گەڵ یاداشتنامەکەدا، کە چەند جار داوامان کرد بهێنرێن بۆ فەرمانگەکەمان و، هەروەها کارکردن لەسەر ناردنی ڕاخەری تۆفیقی کوری سافی (واتە ئەو شتەی کە لە سەری کوژراوە) کە خوێنەکەی لەسەر ڕژاوە و لای موختاری (ڕیش سپی)ی گوندی تەعشیقەیە.

سەرۆکی لیژنەی لێکۆڵینەوەی دیوانی جەنگ

تاهیر

**چاودێری جەنگی:**

**فەرمانگەی پێداویستییە گشتییەکان-هۆبەی دووەم**

بۆ بەڕێز ویلایەتی موسڵ ١٦ی ئەیلوولی ساڵی ٣٣٤:

دەستدرێژییەکانی سنجار بۆ سەر نەخشەکانمان و پێوەندیکردنیان لە گەڵ دووژمنەکاندا و ئەو بارودۆخە سەربازییەی شارۆچکەکە وا پێویست دەکات کە بەڕێوەبەرایەتییەکی سەربازی لە سنجار دابمەزرێت، ناردنی سەرۆکی کەتیبەی سوارەی سی و یەك بەکباشی، ئیبراهیم بەگ وەك سەرۆکی دەستەکە و، دەستەیەکی دیش کە لە هەموو چین و توێژەکان پێکهاتووە بۆ سنجار، ئینجا (بۆزان) ڕێکخراوێکی شێوە سەربازی دروست کرد لە سنجارییەکان بۆ پارێزگاریکردن لە وڵاتەکەیان، ئەمەش ڕێگربوو لە چوونی سووسەکەرانی ئینگلیز بۆ شارۆچکەکە و، وەرگرتنی لایەنگریی سنجارییەکان بۆ دەوڵەت و دەستیان دایە دەستدرێژیکردن بۆ سەر نەخشەکانمان و، لە کاتی پێویستدا سوود لە تابوری دەرك لە سنجار وەردەگرین بۆ پارێزگاریکردن لە وڵات و ڕێگری لە چالاکیی هەواڵگیری، سنجارییەکان ئەو خراپەکارییەی ڕابردوو هەمووی دەگێڕنەوە بۆ خراپی لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا، ئەم ڕاستییەش بە بەڵگە ڕووداو و ڕاستەقینە دەسەلمێنن و، تێڕوانین و لایەنگریی باشی سنجارییەکان بۆ دەوڵەت وای کرد بە شێوەی نایاسایی لە گەڵیاندا نەجووڵێنەوە و دەسەڵات بە خراپ بەکارنەهێنن لە گەڵیاندا، ئەوەش پێوەندیدار بوو بە بارودۆخی جەنگی و، من ڕازی نیم کە سەرۆکی دەستە دەست لە کاروباری ئاسایی و مەدەنی وەربدات، بەڵام ئەگەر کارمەندەکانی دەوڵەت دەسەڵات بەکاربهێنن بۆ ڕێگری لە کارەکان، ئەو کاتە پێویستە لەسەری ئامۆژگاری باشیان بکات، ئەگەر ئامۆژگاریی سوودی نەبوو، ئەو کاتە ئومێدەوارم هەستن بە ئاگادارکردنەوەی پێویست کە قائمقام و بەرپرسەکانی دی و دەستە سەربازییەکە پێکەوە هاوکاری یەك بکەن و هەموو کارە سەربازی و مەدەنییەکان بە یەکەوە ڕایی بکەن، بەڵام لە ڕۆژانی داهاتوودا دەرکەوت کە ئەو بەڕێوەبەرایەتییە ناتوانێت کارەکان وەك پێویست ڕایی بکات، ئەو کاتە ناچار دەبین بۆ دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیی سەربازی تەواو لەوێ.

**فەرماندەی سوپای شەشەم/ علی ئێحسان**

**چاودێری جەنگی:**

**فەرمانگەی پێداویستییە گشتییەکان – شوعبەی سێیەم ٣٤/٩/١**

بۆ مەقامی حەزرەتی فەرماندە:

کاروبارەکانی دەوڵەت لە نێو ویلایەتی موسڵدا بە شێوەیەکی زۆر خراپ بەڕێوە دەچن و، تالاّن و دزی ڕۆژبەڕۆژ پەرە دەسێنێت، ئەو بارودۆخە لە ساڵی ڕابردوودا بووە هۆی مردنی هەزاران کەس لەسەر شەقامەکان، نەمانتوانی هیچ شتێك لە بەرامبەر ئەو بەلاّ و گرفتەدا بکەین و، کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر دەروونمان هەبوو، هەمیشە نەفرینمان لە لایەن خەڵکەوە لێ دەکرا و، نەمانتوانی هاوکاریی ڕۆڵەکانمان بکەین و ئەو ماڵ و داراییە گشتییەش چووە گیرفان و چنگی چەند کەسانێك تا بەردەوام لە خۆشگەزەرانیدا بژین، نەخشەڕێی ویلایەت ئەمجارەش دووبارە بووەوە تاوەکو ئێمە ئاگادار بین لەوەی کە لە ساڵی ڕابردوودا ڕووی داوە، کاریگەریی ئەو بەلاّیە بە ئاشکرایی لەسەر سوپاکەشمان دیاربوو و بووە هۆی مردنی زۆربەی سەربازەکانمان.

هەواڵی گەیشتنی سەرۆك بۆ موسڵ هیوای ژیانی بۆ زۆربەی ستەملێکراوان گێڕایەوە و، مژدەی پێدان بە گێڕانەوەی ژیانێکی خۆش و، زۆربەی خەڵکی خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕی بە چوونە ژێر دەسەلاّتی سەرۆك بە ئومێدی چەسپاندنی دادگەری، هەر بۆیەش ئەوانەی تاوان و خوێنڕێژییان ئەنجام دابوو سەرقاڵ بوون بۆ گەڕان بە دوای جێگەیەکدا کە خۆیانی لێ بشارنەوە و، هەندێ لە خەڵکی ئامادەیی خۆیان دەربڕی بە سەلماندنی ئەو ڕاستییانە بە بەڵگەوە، ئەمانەش هەندێ لەو ڕاستییانەن کە پێیان دام، ئێستاش پێشکەش بە بەڕێزتانی دەکەم، لەمانە:

(١) خراپەکاری لە زەوی دەیەکدا: پشکنەری قەزای گشتی، ئەناستوس ئەفەندی و (داوود یوسفاکی ئەفەندی موسڵی) ئامادەبوون هەموو ئەو بەڵگە خراپانەی لایانە بیانخەنەڕوو.

(٢) وەلاّمی یوزباشی، مەحمود ئەفەندی فەرماندەی سوپای سوارچاکان بەڵگەنامە هەیە دەربارەی هەستانی تابوری دەرك ( یوزباشی نەزمی ئەفەندی) بە کڕین و فرۆشتنی بڕێکی زۆری خواردەمەنی خەڵك بە ناوی دەرکەوە.

(٣) لەگەڵ ئەوەدا باجی ئاژەڵداری بە تەواوی وەرگیرا، بەلاّم بڕێکی زۆر کەمی

تۆمار کرا و، بەشێکی زۆری تۆمار کراوە لە سەر ئەوەی تا ئێستا وەرنەگیراوە، ئەوەش لە ڕێگەی داهاتی دەوڵەتەوە تەواو دەبێت و والی و بەڕێوەبەری ژمێریاری ناوچەکە (عەبدولعەزیز ئەفەندی) دابەشی دەکەن، بە فشارهێنانێکی کەم لەسەر ئەم داهاتە هەموو شتێك دەردەکەوێت.

(٤) یوزباشی نەزمی ئەفەندی، فەماندەی تابوری دەرك پشکێکی گەورەی لە دزینی ئەو خوێیەی کە بە ناوی ماڵەوە دەهێنرا هەبوو و، ئەگەر فشارێکی کەم بخەینە سەر بەڵێندەرە ساختەکارەکە بە ناوی قاسم، هەموو کارە دزی و خراپەکان دەردەخات و، جیگرەکەی داوود ئەفەندی لەمبارەیەوە زانیاریی زۆری لابوو و، ئامادەیی خۆیشی نیشان دا بۆ ئاشکراکردنی هەموو ئەو زانیارییانە.

(٥) ئەو لیژنەیەی کە دەستێکی گەورەی هەیە لە دابینکردنی خۆراك و پێداویستیی شاردا و هەژارەکان ناچار دەکەن لە سەر کڕین و فرۆشتنی بە نرخێکی بەرز کە ڕێك خرابوو و دانرابوو لە لایەن حسێن جلبی و نامیق ئەفەندی ئەندامانی شارەوانی و مستەفا جلبی ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتی و، ئەمین ئەفەندی، سەرۆکی شارەوانی و عەبدولڕەحمان ئەفەندی ئەندامی بەلەدییە و، جەمیل ئەفەندی سابونچی ئەندامی بەلەدییە و، قاسم جلبی و نەشئەت بەگ و عەبدولباقی، ئەمانە هەموویان خاوەنی بەشێکی زۆری ئەو خۆراکانە بوون و، بەکر بەگ ڕاوێژکاری بەلەدییە زانیارییەکی زۆری لا بوو لەمبارەیەوە، ئامادەش بوو ئەو زانیارییانە بدات، بۆیە داوام لە بەڕێزتان کرد کە بە شێوەیەکی تایبەت ڕێگەی پێ بدەن بۆ چاوپێکەوتنێك لە گەڵتاندا تا ئەو زانیارییانەتان پێشکەش بکا.[١٧]

بەڕێوەبەری پۆستەی سەرپێی سوپای شەشەم
یوسف بەهجەت

---

(١٧) ئەمانە چەند نموونەیەکی سادەی ئەو بارودۆخەن کە کورد لەژێر دەستی کاربەدەستانی عوسمانیدا تووشی هاتووە و، گوێیان بە بار و گوزەرانی خەڵك نەداوە و، تەنیا ئامانجیان کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بووە بەهەر ڕێگەیەك بێ، سوڵتان و کاربەدەستانی باڵاش بێ ئاگابوون لێی یان خۆیان لێ بێئاگا کردووە. و.

**وێنەی ئەو بیرخەرەوەی کە بە ژمارە ٤٦٠ لە سەرۆکایەتییەوە بۆ ویلایەتی موسڵ هاتووە،**

لەڕێکەوتی ٥ی ئەیلوولی ساڵی ٣٣٤

دوای هاتنی هەواڵی ئەوەی کە هەندێ کەس لە هۆزی ئەبو حەمید هەوڵیان داوە بە بردنی باری شانزە وشتر خوێ بۆ بەشی لای ڕاستی ڕووباری دیجلە لـە ڕۆژی سێشـەممەی سێی ئەم مانگەدا، پارێزگاری بەڕێوەبەرایەتییەکەمان لە گەڵ پێنج لـە سوارچـاکەکانمان نارد بۆ شوێنی ناوبراو، بە شوێنێکدا پەڕینەوە بۆ گوندی قەرەقیوی سەرەوە کە ناسرابوو بە هەلیلە، توانرا بە بارەوە دەست بەسەر هـەر شـانزە وشـترەکەدا بگیرێـت و یەکسـەر هێنامانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکە، بەڵام یوزباشی، ئەمین ئەفەنـدی فەرمانـدەی دەرك دوێنێ هات بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکە و یەکێك لەو کەسانەی لە گەڵدابوو کە وشـترەکانیان بردبوو، بەڵام وتی ئەمە لەم خوێیە دزراوە نییە، بەڵکو ئەو بڕەیە کە بەڵێنمان دابوو بـە هۆزی (شمر) کە بۆیان بگێڕینەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم خوێیە هی هۆزی (شمـر) نـەبوو، بەڵکو لە لایەن هۆزی ئەبو حەمید وەحدیدییەوە دەستی بەسەردا گیرابـوو و دزرابـوو و، تێم گەیاند کە ناتوانرێـت ئـەو خوێیـە بگێڕدرێتـەوە بـۆ خاوەنـەکانیان، چـونکە ئـەوە بەرپرسیاریەتییەکی ماددییە بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکە، بەڵام گوێی بۆ قسـەکانم نـەگرت و لەسەر کاری خۆی سوور بوو، لەگەڵ ئەوەدا پێم گوت کە بچێت بۆ لای شێخ حاجم شـێخ شمر کە هاتبوو بۆ لامان بۆ گەیاندنی زانیاری دەربارەی دزینی ئەو خوێیە، ئەگـەر شـێخ بڵێت، ئەو بڕە خوێیـە هـی هـۆزی (شمـر)ە، ئـەوا ڕاسـتەوخۆ ئـەو بـڕە دەدەینـەوە بـە خاوەنەکانیان، بەڵام پێمان گەیشت کە شێخ گوتبووی، ئەم خوێیانە هیچ پێوەندییـەکیان بە هۆزی (شمر)ەوە نییە، ئەمانە لە هەوڵی دزیندا بـوون و، داوای کـرد نـاوی لـەمکارە تێوە نەگلێنن،چونکە هیچ گومانی تێدانییە کە بارە خوێی ئەو وشترەش دزراوە و بـراوە وەکو ئەوانی دی، لەو کاتەدا ناوبراو فەرمانی کرد بە سەر دەستوپێوەندەکانی دەرك کـە ڕێگر بن لە هەر کارێکی دزینی خوێ (یان بردنی خوێ) ئەم داوایەی دووبارە کردەوە بـە ئامادەبوونی یوزباشی شاکر ئەفەندی فەرماندەی یەکەی دەرەکیی دەرك .

له کاتێکدا زۆرێك لەو فەرمانانەمان لایە کە لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتییەوە دەرچوون بە هۆی هەستکردنی چاودێری جەنگ بە بوونی هاوکاری لە نێوان لایەنەکانی سەربازی و مەدەنیدا تا هەوڵمان هەبێت لە هەوڵدان بۆ بردنی هەر برە خوێیەك، لە گەڵ ئەوەدا بە فەرمی ناوبراو بەرپرسە لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە، چونکە دانپیانانی بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە لە نێو فەرمانگەیەکی ڕەسمیدا بەوەی کەوا ڕێگریی لە هەموو ئەندامێکی دەرك بکات لە دەستگیرکردنی ئەوانەی کە ماڵی ئەو خەڵکە دەبەن و، هەروەها هەوڵدانی بۆ گێڕانەوەی هەموو ئەو شتانەی کە دەستیان بەسەردا گیراوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەم دوو کارە لە ئەفسەری دەرك چاوەڕوان ناکرێت، کە پێویستە دەوڵەت هۆکاری جێبەجێکردنی ئەم کارە بێت و، دەستتێوەردانی لەمە جێگای داخە، هەتا هاوەڵێکردنی ئەو کەسانەش کە دەدزن هۆکار بوو بۆ لەدەستدانی مافی خەزێنە، لە دوای ئێستاوە نابێت بەڕێوەبەرایەتییەکەمان دڵنیابێت لەوەی کە لە کاری دزی پاك بۆتەوە و ئەم کارە کۆتایی پێ هاتبێت، لەبەر ئەوەی دزین و بردنە دەرەوەی سامانی وڵات زیاد دەکات و بڵاوتر دەبێتەوە، بۆیە زیانەکانی خەزێنە چەند قات زیانی پێ دەگات، ئەم خەملاندنەش بۆ ئێوەی بەڕێز بەجێ دەهێڵین و، بە پێی ئەوەی کە خستمانە ڕوو ئێمە دڵنیا نین لەم پیاوە، بۆیە پێشنیار دەکەین بۆ بەڕێزتان کە بیگۆڕن و کەسێکی دی لە جێگەکەی دابنێن.

## (( بەڵگەنامەکان لەسەر جووڵانەوەی بەدرخان بەگ ))

### Irade Mesail-Imuhimme 1235

**دەرخستەیەك لە بچوکتانەوە بۆ مەقامی چاودێری باڵا:**

ئەوەی پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە لای بەڕێزتان، ئەوەیە کە پێش کۆتاییهاتنی ئەو کێشە و گرفتانەی لە (وان) ڕوویان دا، لە ڕێگەی کەنعان بەگ، بەرپرسی خەزێنەوە زانیاری و نامەمان بۆ هەندێ لە ڕیش سپیانی ناچەکە لەگەڵ خان مەحمود یان براکەی نارد و بانگهێشت کران، لەسەر ئەم داوایەی ناوبراو لە گەڵ حەوت تا هەشت کەسی

ناودار هاتن له (ئەرزڕۆم) میوانداری کران و به شێوەیەکی نەرمونیان هەڵسوکەوتمان لـە گەڵدا کردن، چەند جار داوام لیّ کردن که بێن بـۆ لام تـا هەسـت بـە نـامۆیی نەکـەن، هــەموو ئامۆژگارییــەکم کــردن و بــۆم ڕوون کردنــەوە کــە مەبەســت لــە ڕێکخســتن و چاکسازییەکان پارێزگاریکردنە لە خەڵك و لابردنی زوڵم و دەستدرێژییەکانە لە سـەریان و، ئەوانەی ڕێگری دەکەن لەو کارە چاکسـازییانە، دوورن لـە بازنـەی ڕابەرایـەتیکردن، ئەوانەی دژی دەوەستنەوە لە لای سوڵتان بەرپرسن لـە هەڵسـوکەوتەکانیان، خـەڵك بـە گشتی لە فەرمانەکە گەیشتن و بەڵێنیان دا هەر شتێك کە پێویست بێت لە ماوەی چـل ڕۆژدا جێبەجێی بکەن، لە ڕۆژی بیست و دووی مانگی (زی الحجـە) و ڕیشسـپییەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان تا ئەوان ژمارەیەك لە گەورە و ڕیشسـپیی دیلـەکان بنێـرن بـۆ لامان، هەروەکو چۆن بۆ لای ناوبراو خان مەحمود نامــەی ئاگادارکردنــەوە و ترسـاندنمان نــارد و، لــە ڕاپۆرتەکــەی پێشــوودا ڕوونم کــردەوە دوای تــەواوبوونی ئــەو ماوەیــە هەڵسوکەوتی خەڵك تەماشاکە و ئاگادارمان کەوە لەوەی کە پێویستە بیکـەین، ئەگـەر ئەو کەسانەی کـە داواکـراون هـاتن وەکـو چـۆن لـە دانیشـتنەکەدا بـاس کـراوە دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە، کە بڕیاریان دا فەرمانی سوڵتان جێبەجیّ بکەن ئـەوا چـاو لـە هەموو ئەوشتانە بپۆشن کە دەگوتران، بەڵام ئەگەر ئەو ماوەیە تەواو بوو و ئەو کەسـانە نــەهاتن و بــەردەوام بــوون لەســەر کــاری خۆیــان ئــەوا ڕاسـتی بارودۆخەکـە بۆخـۆی دەردەکەوێت و، ئەو کاتە هیچ بەڵگەیان نامێنێت و ئەو کاتـەش بەرپرسـیارییەتەکەیان گەورەتر دەبێـت، ئـەو کـات هــەموو ڕێوشـوێنەکان دەگیرێنەبـەر بـۆ ئـەوەی بـۆ ژێـر گوێڕایەڵیی سوڵتان بیان گێڕینەوە، بەڵام ماوەی دیاریکراو تەواو ببوو بیسـت و دوو ڕۆژ بەسەر ماوەکەیدا تێپەڕیبوو، خەڵکی ناوبراو هیچ وەڵامێکیان نەبوو، بـانگکراو حسـێن ئاغا کە ببوو بە یەکێك لەوان لە گەڵ یەکێك لە پیاوەکانی نامەیەکی بـۆ نـاردم، بـەڵام نامەکە نەگەیشت بە دەستم، لەبەر ئـەوەی لـە ڕێگـادا لـە نامەبەرەکـە سـەنرابوو و، قائمقام بە تەواوی دابڕا و هیچ کەسێك نەدەچوو بە لایدا، ئینجا بـە ئـارەزووی خۆیـان دەستیان لە کاروباری وەردا و هەرکاتێك بیانویستایە هەڕەشـەیان لـیّ دەکـرد، کاتێـك ڕیشسپییەکان گەڕانەوە، دەستپێشخەرییان لە پچڕاندنی پێوەندی لە گەڵماندا بە تەواوی کرد.

نەماندەتوانی لە کارەکـانی تێبگـەین، هـیچ شـتێك نـەمابوو بەڵگـە بێـت لەسـەر گوێڕایەڵییان بۆ سوڵتان، ئەمەش کە لەو کەسانەوە زانیمان کە دەهاتن بۆ ئێـرە، هـەتا حسین بەگی ئەعور کە یەکێك بوو لە ئەمیرەکانی (جلدر) لە سـەردەمی فەرمانڕەواییـدا بە فەرمانی سوننییەکان حاجی کامل پاشای نارد بۆ خانەی سەعادە و هەندێ مایەوە و یەکسەر دەستبەسەر کرا، لە دواییدا هـەڵاتن بـۆ میسـر و، لـەم ماوانـەی دواییـدا بـە شێوەیەك لە شێوەکان هاتن بۆ (وان)، کاتێك کوڕەکەی محەمەد عەلی بەگ، منی بینـی نامەیەکی پێم دا کە تێیدا هاتبوو، مەبەستی هاتنی لە میسرەوە بۆ وان گـوێگرتن لـە شـوێنەکەوتەکانم بـوو لـە ئـەرزڕۆم، بـە هـۆی گرینگیـی باتەکـەوە هیـوای خواسـت هەڵسوکەوتێکی باشیان لە گەڵدا بکرێت، بەڵام ئێمە دەڵێین هاتنی بۆ (وان) لەسەر ئـەو نامەیە نەبوو، بەڵکو بە هۆی بینینی ئاڵۆزییەکانی (جلدر) و دەوروبەرییەوە بوو، بـیر و باوەڕی وا بوو کە کات گونجاوە بۆ ئەنجامدانی خراپە، بەڵام ناردنی ئەو نامەیەی کـە دام بە کوڕەکەم تەنیا بۆ لادان لە هۆکاری هێز و درۆ و دەلەسە بوو، پاشـان بارگرژییـەکانی (جلدر) بەمشێوەیە نەمابوو کە لە میسر بیسـتبووی و، نـەیتوانی ڕاسـتەخۆ بێـت بـۆ (جلدر) هەتا دڵنیا نەبوو لە بارودۆخەکە و، سەرکردەی ئاژاوە گێڕەییەکان دڵخۆش بوون بە هاتنی، ئەو بەخێرهێنان و ڕێزەی کە لێیان گرت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ناوبـانگی لە خراپەکاریدا نەماوە، ئەوە هۆکارێکی دیارە بۆ جووڵاندنی (جلـدر) و دەوروبـەری لـە پێناو هاوکاری و یەکگرتوویی لە گەڵیاندا بۆ کاری تێکدان.

وەڵامم دایەوە، بۆ ئەوەی ئێمە ئەوە بە ڕاست دابنێین کە بۆ کوڕەکەی خۆی نـاردوە، باشتر وایە لە میسرەوە ڕاستەوخۆ بێت بۆ ئێرە، هەر چۆنێك بێ کێشە نییە کـە پێشـتر چووە بۆ (وان)، لەبەر ئەوەی باوکت لە خانەی سەعادەوە بۆ میسر ڕای کرد، کە ئەمـەش شتێکی گونجاو نەبوو، بەڵام ئەگەر بێت لە بۆ لامان داوا لە بابی عالی دەکەین کە لێـی ببوورێت، کوڕەکەشی هەر ئەو کارەی کرد، واتە نامەیەکی بـۆ نووسـی و بـە یەکێکـدا ناردی بۆی، بەڵام پیاوەکە هەتا ئێسـتا نەگەڕاوەتـەوە، نـەمانزانی وەڵامـی داواکـەمان دەداتەوە و دێت، یان نا، بەڵام بە هۆی سـووربوونی (وان)ییـەکان لـە سـەر بـەپاکردنی جووڵانەوەیـەکی سـەربازی وای کـرد بچـێت بـۆ لایـان و لـە گـەڵ بـیر و بۆچـوونە خراپەکارییەکەی ڕێگەی تێ نەدەچوو، بچێت بۆ ئەم لایە و، نامەی نهێنیمـان نـارد بـۆ

قائمقامی ئەو شوێنانە بۆ ئاگادارکردنەوەیان لەو کارە خراپانەی کە دەتوانێت بیان کات، هەروەکو هاتنی بۆ (وان) وانییەکانی زیاتر هان دا لە سەر کاری خراپە، لەبەر ئەوە ناوبراو مستەفا بەگ لەگەڵ خان مەحمود نوورەڵا بەگی ئەمیری هەکاری و، ئەوانی دیش لە کەسە ناسراوەکان لە گەڵ بەدرخان بەگی هاوسێیان ڕێك کەوتن لەسەر دژایەتیکردنی دەسەڵاتی سوننی، ئامۆژگاری سوودی پێ نەدەگەیاندن و دەرچوون لە گوێڕایەڵیکردنی گەورەمان و گەیشتنە ئەوپەڕی پلەی سەرپێچیکاری و خراپە، کە بە پێی یاسا شایەنی سزایەکی توند بوون.

سەرنجەکانی کامیل پاشای فەرماندەی ویلایەتی (سەیدا) لە کاتی سەفەرکردنیدا بۆ (وان) و دەوروبەری و (سری پاشای) قائمقامی ئێستای (قارس) لە ماوەی کارەکیدا لە (وان) لەسەر هەڵسوکەوتی ئەوان ئاماژەیان بەوە داوە، کە ئەوانە هەموو سنوورێکیان بەزاندووە و، ئەگەر ڕێوشوێنێکی بەهێز (بە پشتیوانیی خوا) نەگرینە بەر لەبەرامبەریاندا، ناتوانین بیانخەینە ژێر دەسەڵاتی خۆمان و، لێبوردن و ئاسانکاریکردن لە تەمێکردنی ئەوانەدا، نەك هەر دەبێتە هۆی زیادبوونی زەرەر و خراپەکاری زیاتر، بەڵکو ئەو جۆرە خراپەکارییانە بۆ ناوچەکانی دیش سەر دەکێشن.

لە لایەکی تریشەوە، دەڵێن شەریف بەگ کە پێشتر لە (موش) قائمقام بووە، هەرچۆنێك بێت بەرژەوەندیی لەوەدایە لە شوێنەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و، لابردنی جێی بەرژەوەندی نییە و، لە پێوەندییەکی بەردەوام بوو لە گەڵ (خان مەحمود)دا، بە هۆی ئەو ئەزموونەی لەگەڵ میری ناوبراویدا هەبوو، هیچ هیوایەك نەبوو کە ئەو خزمەتێکی جێگای ڕەزامەندی ئەنجام دەدات، بۆیە پێویست بوو بگەینە هۆیەکانی بەهێزکردنی پێوەندی لە گەڵ ئەو شوێنانەدا، ئەوەش بە دڵنیاییەوە پێویستی بە هێزی سەربازی هەیە و، ئەگەر ڕێوشوێنی پێویست بە شێوەیەکی باش بەکار بهێنێت ئەوا ئەنجامدانی چاکسازی لەو شوێنانەدا کارێکی قورس نابێت، ئەگەر بڕیار بدرێت بە ناردن و دیاریکردنی سەربازی سوڵتان ئەوا وێدەچێت لە قەڵای (وان)دا بمێنینەوە لە گەڵ قەڵای مەحمودی کائنە لە قەزای خان مەحمود کە لە لایەن بەدرخانەوە پشتگیری دەکرێت، بۆیە شتێکی ئاساییە کە هێزی تەواو بنێردرێت، بەش بەش ڕوونم کردۆتەوە لەو وەرەقەیەی کە بۆ بەڕێزتانم نارد لەمەڕ چۆنییەتیی ئەنجامدانی کاری پێویستەوە و چۆنییەتیی جووڵە

و دانانی کارمەندێکی تایبەت کە گوێڕایەڵی بەدرخان بێت و، چاوپۆشی بکات لە هاوکاریکردنی ئەوانی دیکە، هەروەکو ئەوەی کە پێویست بوو هەردوو والیی موسڵ و دیاربەکر و فەرماندەی سوپای ئەنادۆڵی هومایونی بیکات.

دوای بینینی ئەوەی کە لە وەرەقەکەدا هاتووە لە لایەن مەقامی باڵاوە، یان هەڵسوکەوتەکە بەو شێوەیە دەبێت کە باس کرا، یان بە شێوەیەکی دی دەبێت، شێوەی ئەو کارانە پەیوەستە بە ئیرادەی سونییەوە، لەمەودوا هەرچۆنێك بێت کاری تەمێکردنی پێویست لە (وان)دا دژی مستەفا بەگ و خان مەحمود و بەدرخان دەست پێدەکات، بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکرێت تا وەرزی بەهار دێت، بەڵام ئەگەر ساردی و سڕی لەو کارەدا بکرێت ئەوا خراپەکارییەکانیان بڵاو دەبێتەوە لە شوێنەکانی دیش، ئەو کاتە کارەکە گرانتر دەکەن، ئەو ڕاپۆرتەم نووسی بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستیی بارودۆخەکە بۆ چاودێریی بەڕێزتان... فەرمان لە هەموو بارودۆخەکاندا بۆ گەورەمانە.

**٢٥ی سەفەری ساڵی ٣٢**

مۆر (ختم)

## Irade Mesail-Imuhimme 1235

ئەو بارودۆخەی ئێستا (وان) بە خۆیەوە دەبینێت، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش وا بمێنێتەوە، دەبێتە هۆی زیانێکی زۆر بۆ وڵات، لەو ڕاپۆرتەدا ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی و دڵسۆزیی خۆم دەردەبڕم لەم بوارەدا، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی خستنەگەڕی توانای تەواو بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست لە ئێستاوە بۆ جێبەجێکردنی کاری پێویست لە وەرزی بەهاردا، بە پشتیوانیی (خوای گەورە) و یارمەتی و توانای مەولانا سوڵتان.

ئەو ناوچانەی باسمان کردن لانەی خێڵ و هۆزەکانن، لەبەر ئەوەی هەندێ کات سەرپێچییان دەکرد و لە گوێڕایەڵی و وەکو پێویست نەبوون، لە گەڵ ئەوەشدا گەورەکان بە پێی توانا دەسەڵاتی خۆیان بە کار دەهێنا و، لە ماوەی جێبەجێکردنی چاکسازییە خێرخوازییەکاندا لە ویلایەتی ئەرزڕۆمدا نەیانتوانی ئەو بەرپرسیارەتییانە وەکو پێویست

جێبەجێ بکەن، بە شێوەیەك مەحمود خان توانی بۆ ماوەی دە ساڵ دەست بگرێت بەسەر هەندێ قەزای سەر بە (وان)دا و، هەروەها نوورەڵا بەگ کە لە ناوچەی هەکاری بوو توانی نێزیکەی بیست ساڵ دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا بسەپێنێت و، ناوبراوان لە سەرەتای کارەکەدا ڕێك کەوتن و پاشان پێوەندییان کرد بە مستەفا بەگەوە لە (وان) کە لە خانەوادەی (تەیمور ئوغلۆ) بوو، کە ناسراو بوون بە دووبەرەکی و ئاژاوەگێڕی، ئەمانە هەموویان پێکەوە دژی دەسەڵاتی دەوڵەت وەستانەوە، چەندین ساڵ هێرشیان دەکردە سەر و زەرەرێکی زۆریان پێ دەگەیاند، لە دواییدا بەدرخانیان ئاگادار کردەوە، ئینجا لە نێوان خۆیاندا پەیمان و بەڵێنیان بە یەکتر دا کە هاوکاریی یەکتر بکەن لەسەر هەر دەستدرێژییەك کە لە لایەن دەوڵەتەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە(١٨)، بەم شێوەیەی کە لە ڕاپۆرتەکەمدا باسم کرد قائمقامی (موش) کە لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی ئاشکرا نەهاتبووە نێو ئەم هاوپەیمانییەتەوە و، کەمتەرخەمیشی نەدەکرد لە پێوەندیکردن لەگەڵ دەوڵەتدا، چونکە بە سروشتی خۆی کەسێکی خیانەتکار بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی سوننی ئەو لایەنەی تەمێ کرد کە بە شتێکی پێویست و یاسایی دەزانی، بۆ نموونە، ئەگەر بڕیار بدرێت بەرپرسێك لە (وان) دابنرێت و بەدرخان لە شوێنی خۆی بهێڵدرێتەوە، ئەوا زۆر گران دەبێت بۆ ئەو بەرپرسە کە بتوانێت کاری خۆی جێبەجێ بکات و، لە بەرامبەردا ئەگەر بەدرخان لە شوێنی خۆی دابنێرێت و بەشی (وان) دوا بخرێت، ئەوا بەرژەوەندییەکانمان نایەنە دی، بۆیە دانانی دوو بەرپرس بۆ هەردوو لا و بە هێزی سەربازی تەواو پاڵپشتییان بکەین بە پشتیوانیی (خوای گەورە) هێنانە دی بەرژەوەندییەکانمان ئاسان دەکەن، بەڵام بە هۆی کۆتاییپێنەهاتنی کێشەی ئێران، ئەگەر دەستپێشخەری ناردنی سوپا بۆ هەردوو لا پاڵپشت نەبێت بە ڕەزامەندیی

(١٨) یەکێك لەو کارە گرینگانەی بەدرخان بەگ کە بە ئاراستەی سەربەخۆیی و یەکگرتنی کورد نای، بریتی بوو لە دروستکردنی هاوپەیمانییەتیەك لەگەڵ میر و سەرۆك هۆزەکانی ناوچەیەکی بەرفرەوانی کوردستاندا، کە بە (پەیمانی پیرۆز-الحلف المقدس)ناسراوە بە سەرکردایەتیی خۆی، بۆ زانیاری بڕوانە: **سعدی عثمان هروری، کوردستان والامبراتوریة العثمانیة**، ص٢١٢؛ عەبدوڵا عەلیاوایی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە تا جەنگی جیهانیی یەکەم (لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری مێژووی سیاسیدا)، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٨. و.

بالاوە، وەك لامان ئاشكرایە والیی ئەرزڕۆم لە پێشدا وەك سەرۆكی سوپا كاری پێ سپێردرابوو لە ناوچەكانی ڕۆژهەلاتدا، ئەگەر ئەو سەرۆكایەتییەش ڕەت كرابێتەوە لە لایەن ویلایەتی ناوبراوەوە ئەوا چاودێریی ناوبراو هەر بەردەوامە و دەتوانرێت لیوای (موش) بلكێنرێت بە ویلایەتی (وان)ەوە، لە گەلّ هێشتنەوەیدا لە ژێر چاودێریی ناوبراودا، وەزیرێك لەسەری دیاری بكرێت، كۆمەلّێك یان سەرۆكێك دیاری بكرێت كە شارەزایی و لێهاتوویيەكی تەواوی هەبێت لەو شوێنانەی كەوتوونەتە ژێر دەسەلاتی بەردخان یان ژێر چاودێریی فەرماندەی سوپای ئەنادۆلّی هومایونی، بۆیە دەتوانرێت پالّپشتیی ئەو وەزیرە بكرێت كە دەنێردرێت بۆ ئەو ناوچەیە، یان ئەو سەركردەیەی كە لەو لایەنەوە دەنێردرێت بە بەشێك یان دوو بەشی سەربازی ڕێكخراوی سولّتانییەوە، لە گەلّ ئەندازەی پێویست لە خواردەمەنی و كەلوپەلی سەربازی، وەك والی دەتوانێت بچێت بۆ ئەو شوێنەی سەر بە ویلایەتە، یان لیوا دەتوانێت بچێتە نێویەوە، یان بچێتە نێو قەزایەك كە سەر بە ویلایەتێكی تر بێت و، نێزیك بێت لەسەر سنووری ویلایەتەكەی، یەكسەر دەست ناكات بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی سەربازی، بەلّكو بەجۆرێك نەرمونیانی و هەلّسوكەوتی باش لە گەلّ خەلّكەكەی، داوا لە خەلّك دەكات كە گوێڕایەلّیی گەورەمان بكەین و، ئێمەش لە بەرامبەردا دلّنیایی سەلامەتییان پێ دەدەین، كەواتە لە هەموو بارەكاندا ئەوەی كە دەمانەوێت دێتە دی، بە بێ ئەوەی پەنا بۆ هێز بەرین (بە پشتیوانیی خوای گەورە)، بەلام ئەگەر ئەوەی كە دەمانەوێت بەم ڕێگایەدا جێبەجێ نەبوو، ئەوا پێویست دەكات ڕەزامەندی بدەین لەسەر بەكارهێنانی هێز.

هاتنەدی ئەو بابەتانەی كە لە بەشی دووەمدا باسمان كردن لەسەر ڕەزامەندیی بالا ڕاوەستاوە، پێویست دەكات لە لایەن فەرماندەی سوپای ئەنادۆلّەوە ئەو كەسە دیاری بكرێت كە دەنێردرێت بۆ لای بەدرخان و، بەرژەوەندی وا دەخوازێت كە والی دیاربەكر و موسلّ ئاگادار بكەینەوە بۆ پالّپشتیكردنی ناوبراو ئەگەر پێویست بكات، ئەو بەرپرسە گومانی تێدانییە دەبێت بە فەرمانی گەورەمان بێت، بۆیە ئەو بەرپرسەی كە دیاری دەكرێت دەبێت لە كەسە شارەزا و ئاگادارەكان بێت لە بارودۆخی ئێستا و پێشووی ئەو شوێنانەی كە پێی دەسپێردرێت و، دەبێت لە كەسانی شارەزا و وردبین و زیرەك بێت.

عتوفەی بحری پاشا، سەرۆکی سوپای ئەرزڕۆم هەموو ئەو سیفەتانەی تێدا بەدی دەکرێن، خزمەتێکی دیاریشی لەو ناوچانەدا هەبووە، یەکێکە لەو پیاوە بەهێز و توانا و لێهاتووانەی کە بە لێهاتوویی خۆی گەیشتۆتە ئەم پلەیە، ئێستا کاتی ئەوەیە کە پلەی بەرز بکەینەوە.

بە هۆی ئاگاداری و شارەزایی بە سەر هەموو ئەو ناوچانەدا و ئەو هەڵسوکەوتەی کە لە نێوانماندا هەبوو وەکو هەڵسوکەوتی باوك لە گەڵ کوڕەکەی، بۆیە شایەنی ئەوە بوو کە پلەی وەزارەتی پێ ببەخشرێت، هیچ کەموکورییەك نەبوو لە هێنانەوەی ئارامی و ئاسایش بۆ ئەو ناوچانە بە بێ ئەوەی زۆر لە سەرمان بوەستێت و، هیچ کەمتەرخەم نەبوو لە یارمەتیی پێویست لەم پێناوەدا، بۆیە ئازایەتی نیشان دا لە ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر بەرزکردنەوەی پلەکەی بە هۆی گرینگیی بابەتەکەوە کە ئەو پلە بەرزە لە خۆ دەگرێت.

لە حاڵەتی دەستبەکاربونی ناوبراو لەسەر ئەو بەرپرسیارەتییەی کە باسمان کرد، هیچ پێویست ناکات کە ڕاستەخۆ پەنا ببرێتە بەر بەکارهێنانی هێز بۆ هێنانەدیی ئامانجەکان، ئەوەش سەردەکێشێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پێوەندییەی کە لە نێوان خەڵکدا بەسترابوو و، ناچار کرابوون شوێن سەرپێچیکەران بکەون و، نەهێشتنی متمانە لە نێوانیاندا و کارئاسانیکردن بۆ گەڕانەوەیان بۆ ژێر دەسەڵات و گوێڕایەڵیی دەوڵەت، باشترین کەس کە بتوانێت ئەو بەرژەوەندییە بهێنێتەدی (ئیسحاق پاشا)یە، کە یەکێکە لەو کەسە بەڕێز و خانەوادە کۆنانەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کە لە پێشدا قائمقامی (وان) بووە، بەڵام ئێستا لە ژیان و گوزەرانێکی ناخۆش و سەختدا دەژێت و، کوڕەکەی (تەیفور بەگ) کە پلەی بەکباشیی هەبوو، سەرۆکی تابوری سەربازە یەدەگەکان بوو کە لە وان کۆکرابوونەوە لە ماوەی دوو فەرمانڕەواکەی پێشووتردا و، هەر لەو پلەیەدا دەمێنێتەوە کاتێك ئەو تابورە دەگۆڕدرێت بۆ سەربازی نیزامی.

ئەگەر کوڕ و بابە هەردووکیان بە یەکەوە نێردران و، ئەوە دڵسۆزانە کار بۆ دەوڵەتی عیللی دەکەن، ئەوان هەردووکیان خزم و کەسوکاری زۆریان لەم ناوچانەدا هەیە، توانایان هەیە لەسەر بانگکردن و کۆکردنەوەی خەڵك لە نێوەوە و دەرەوە، ئەو کەسانەش کە لە گەڵیاندا نین، هانیان دەدەن بێنە ژێر گوێڕایەڵیی دەوڵەتەوە.

من لەبارەی ئەمەوە قسەم بۆ کەس نەکردووە، جگە لەوەی کە لە ماوەی لێکۆڵینەوە نهێنییەکانمدا لە گەڵ تەیفور بەگ پرسیارم لە بارەی (وان)ەوە لیٚ کردووە، وتم ((ئەگەر دەوڵەتی باڵا لێپرسراوێك دابنێت بە مەبەستی گێڕانەوەی ئاسایش بۆ (وان) و، تۆ دابنێت بە قائمقامی هەکاری بە پلەیەکی گەورە، ئایا دەتوانێت ئەم خزمەتگوزارییانە ڕاپی بکەیت، وەکو نانەوەی دووبەرەکی لە نێوان خەڵك و سەرپێچیکاران لە نێو (وان) و دەوروبەریدا ؟))[19]

وەڵامەکەی ئەوە بوو کە لەگەڵ باوکیدا لەمەودوا بەوپەڕی دڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە ئەو ئەرکە جێبەجیٚ دەکەن و، ئامادەن بۆ قوربانیدان بە گیان و هەموو شتێکی گرانبەها بۆ هێنانەدیی ئەو ئامانجە و، جەختیان کردەوە کە وەك دوو سەرباز ئەرکەکانیان جێبەجیٚ دەکەن، کار لە گەڵ ئەو کەسەی کە بۆ ئەم کارە گرینگە دیاری دەکرێت دەکەن، لە کاتێکدا کە گەورەی ناوبراو شایەنی متمانەیە کە بە پلەی (ئەمیر ئالای) سوپای نیزامی ڕێزی لیٚ بگیرێت و، باوکیشی پلەیەکی گونجاوی وەك قایمقامی پیٚ ببەخشرێت، ئەوە هەردووکیان لەگەڵ ئەمیر ئالای سوپای نیزامی کاری خۆیان ڕادەپەڕێنن و، سەرکەوتوو دەبن لە پەرتەوازەکردن و ناکۆکی دروستکردن لە نێوان زۆربەی خەڵکە سەرپێچیکارەکاندا و، دەشتوانن ئەو یەکێتی و تەباییەی نێوانیان نەهێڵن و لە نێوی بەرن.

لە کاتی ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر فەرمانداریی ئاماژەپێکراودا، تکایە دەسەڵاتی سوننی ئاگادار بکەنەوە پێش کۆتایی مانگی ئازار، تا دەستپێشخەری بکات لە هێنان و دڵنیاکردنی ئەوانەی وابەستەی (وان) و دەوروبەری بوون و، هەوڵدان و دەستکردن بە کۆکردنەوەی سەرپێچیکاران، ژمارەی سەربازە نیزامییەکان بە پێرۆ و سوارە و تۆپخانە لە ئەرزڕۆم نێزیکەی پێنج هەزار بوو، ئەوە بە بیٚ ژمارەی دیاریکراو لەبەر نەگونجانی

(١٩) ئەوە سیاسەتێکی دیاری دەوڵەتی عوسمانی بووە بەرامبەر بە کورد کەبە سیاسەتی (پەرت بکە زاڵ دەبیت- فرق تسد) ناسراوە، بەداخەوە کوردیش زۆربەی کات بەپەیڕەوکردنی ئەم جۆرە سیاسەتە بەرامبەری هەڵخەڵەتاوە، بەو هۆیەشەوە زیانی زۆریان لە جووڵانەوەکەی داوە، بڕوانە: **سعدی عثمان، کوردستان والامبراتورية العثمانية**، ص٩٤؛ عەبدوڵا عەلیاوایی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، ل١٠٢. و.

بارودۆخی ئێستا، هەروەها ئەو سەربازانەی تەنیا سەربازی ناوچەیی بوون وای کـرد لـە چالاکییە سەربازییەکان پشتیان پێ ببەسترێت، ئەوەش فـەرمانێکی ڕاسـت نـەبوو، بـە هۆی هەندێ سەرنجەوە و، ئەو هێزە سەربازییە لە ئەرزڕۆم و بایەزیـد و تبلـیس دابـەش کرابوون، بەڵام بە تەواوی گواسترانەوە لەو شوێنانەوە بۆ (وان)، ئەوەش ڕایەکی گونجـاو نـەبوو، چـونکە مانـەوەی هەنـدێ سـەرباز لـە ئـەرزڕۆم و گواسـتنەوەی هەنـدێکیان، مەبەستەکەمان ناهێنێتەدی، پێویستیی کارەکـە وا دەخوازێـت، کـە توانایـەکی زیـاتر بخەینە گەڕ بە ناردنی بەشێك یا دوو بەش سەرباز بە هەموو پێداویستی و ئامادەکارییە سەربازییەکانەوە لە خانەی سەعادەوە یان لە سوپای ئەنادۆڵی هومایۆنییەوە، پێویسـتە سوور بین لە سـەر نـاردنی لـە مـاوەی مـانگی ئـازاردا و، لـە نێـو ئـەو سـەربازانەدا ئەسپسوارەکانمان باش کردن، ژمارەی سـەربازە تۆمارکراوەکـانی سوارچـاکان چوارسـەد بوون، ولاخمان بۆ دانەنابوون تەنیا چل سەرباز نەبێ، ئەوەش بە هۆی قەیرانی داراییـەوە کە ئەرزڕۆم پێیەوە دەینالاند و، ئەگەر ولاخمان بۆ هـەموو سـەربازەکان ئامـادە کردبـا، ئەوا وا دەبینرا کە ئەو سەربازانە لە (وان)ەوە ئامادە کراون، بەڵام ئێستا پێویستمان بـە پێنج سەد یان شەش سەد سوارە هەیە، تکام وایە کە ئەو فەرمانڕەوایە ئاگادار بکەنەوە بە هەموو ئەو شتانە و توانای ئەوەی پێ بدرێت کە ئـەو ژمـارە سـوارە نیزامییـە کـۆ بکاتەوە، بە مووچەی مانگانە و بەکاریان بهێنێت.

لە کاتێکدا دەسـەڵاتی سـوننی ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسـەر هـەموو ئـەو شـتانەی سەرەوە، بۆیە پێویستی بە سەرنجدان نییە و، ئەگەر ئەو کەسانەی پێویستمان پێیانە بـە پێی ئـەو پلەیـەی کـە دامانـنـاوە بۆیـان لـە هـەموو پلـە جیاوازەکـان، وەك گـەورەی دەرگاوانەکان یان ئوستاد بۆ هێنانی خەڵك بۆ نێو دەوڵەت و سـزادانی سەرپێچـیکاران، ئەمەش پێوەندیی بە ڕادەی خزمەتەکەیانەوە هەیە، دەوڵەت بـەڵێنیی خـۆی دێنێتـەدی لـەم مەرجانـەدا، بـەڵام بـەپێی پلـە و جۆرەکـەی پێیـان دەبەخشـێت، بەرژەوەنـدی وا دەخوازێت لە دەسـەڵاتی سـوننییەوە ڕەزامەنـدی دەربڕێـت بـۆ جێبـەجێکردنی کـاری پێویست دوای پێشکەشکردنی دەفتەری تایبەت لەمبارەیەوە.

ئەگەر هۆکارەکانی هێنانی ئەو ناوچانە بۆ ژێر گوێڕایەڵیی حەزرەتی مەولانا سوڵتان ئاسان کرا و خەڵکەکەمان لە ژێر دەستی سەرپێچیکاران دەرهێنا، ئەوا شـارێکی وەکـو

(وان) ئامادەیە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەسەڵاتی سوننی و، دەبێتە قەڵایەکیش لە دەستی خیانەتکار و فێڵباز و سەرپێچیکاران دەپارێزرێت، هەروەکو چۆن شارێکی وەکو (هەکاری) خیانەتکارانی وەکو خان مەحمود دەستی تێوەردەدەن کە لە چەند قەزایەك پێك دێت، زیاتر لە پێنج هەزار و موسڵمان و هی دیشی تێدا دەژین و، زۆر کانزای بە نرخی تێدایە وەك زرنیخ و قورقوشم، کە دەتوانرێت باجێکی زۆری لێ کۆبکرێتەوە و ژمارەیەکی زۆر سەربازی نیزامی پێ ئامادە بکرێت و، چەند لایەنێکی دی وەکو ئەوەی کە سەرسنووری خانەقایە، بەمشێوەیە سەردەمێکی تازە و پڕشنگدار دەست پێدەکات، ئەو وێنەیە و هەر وێنەیەکی دیش دەکەێتە سەر دەسەڵاتی سوننی کە کار بکات لەسەر پاککردنەوەی ئەو ناوچانە... فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

**٢٥ی سەفەری ساڵی ٦٢(١٨٤٥ز)**

**ئیمزا: ئەسعەد موخلیس**

### دەوڵەتە گەورە و ورە بەرزەکەم/

وەکو بەڕێزتان دەزانن ئەو چاکسازییانەی کە پێوەندیداربوون بە (وان)ەوە نەهاتنەدی و، فەرماندەی ئەرزڕۆم (عتوفە اسعد پاشا) لە کاتی چوونی بۆ شوێنی ناوبراو هەرچی لە توانایدا بوو لە گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی ئارامی و سەلامەتی بۆ هێنانەدیی باشترین شێوە لە بەڕێوەبردندا ئەنجامی دا، بەڵام بە هۆی ئەو هاوپەیمانەتییەی نێوان مستەفا بەگ لە (وان) و (خان مەحمود و نوورەڵا بەگ)ی میری هەکاری لە گەڵ بەدرخان بەگ کە لای خەڵکی وان زۆر ناسراو بوو، لەسەر سەرپێچیکردنی (هەڵگەڕانەوە) لە دەسەڵاتی سوننی هیچ سیمایەکی گوێڕایەڵییان بۆ دەوڵەت پێوە دیار نەبوو، بۆیە بارودۆخەکە بەرەو خراپی ڕۆیشت و، لەسەر بەکارهێنانی هێزی سەربازی جەخت کرایەوە لە لایەن سوڵتانی گەورەمانەوە بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی کورتدا سنوورێك بۆ ئەو بارودۆخانە دابنرێت.

ئەمجارەیان نووسراوێك و ڕاپۆرتێك لە لایەن پاشای ناوبراوەوە هات، کە هەموو ڕێوشوێنێکی تەواوی تێدا دیاری کرابوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و، هەروەها وەرگێڕدرا بۆ سەر زمانی ئینگلیزی و ڕووسی و، بۆ هەردوو کونسوڵی بەریتانیا و

ڕووسیا لە ئەرزڕۆم نێردران، بەڵام لەبەر (حسێن ئەلئەعوری کوری سەلیم پاشا) جاریکی دی ئەم نامەیە نێردرا بۆ کونسوڵی ڕووسیا و وەرگێڕدرایەوە (دیارە بۆ سەر زمانی عوسمانی. و)، هەروەها ئەو نووسراوەی کە لە سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی باڵاوە هات ڕای تایبەتی بوو، بریکارەکان لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی کە ڕۆژی چوارشەممەی ڕابردوو بەسترا، چاویان بە نامە و ڕاپۆرت و وەرگێڕدراوەکاندا خشاندەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری دروستبوونی ئەو کێشە و دووبەرەکییانە کە پێوەندیدار بوون بە (وان)ەوە ڕوون و ئاشکرا بوون، لێکۆڵینەوە لە بارەیانەوە کرا و هەندێ ڕوونکردنەوەش درا.

لە ڕاستیدا ئەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە، لەبەر ئەوەی خاوەن بەرژەوەندی و فەرمانڕەواکانی (وان) بە هۆی بەرژەوەندیی خۆیان و دەستوەردانیان لە هەموو کارێکدا لە واتای ئەوە نەگەیشتبوون کە مەبەستی سەرەکیمان لەوەی ویلایەتی ئەرزڕۆم بخەینە نێو بازنەی چاکسازییەکانمانەوە بۆ سوودمەندبوون لە دادگەری و سۆز و بەزەیی سوڵتان، هەروەکو چۆن ئەو بەرپرسانەی کە لە ئەرزڕۆم بوون نەیانتوانی کاری خۆیان جێبەجێ بکەن، بەڵام (عتوفەی کامیل پاشا) لە لایەن دەوڵەتەوە ئەم کارەی پێ سپێردرا، دڵنیایی بە خەڵکی (وان) دا دەربارەی نیازپاکیی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرامبەریاندا، هەروەکو چۆن (ئەسعەد پاشا) لە کاتی گەیشتنی بۆ مەڵبەندی کارەکەی هەموو توانایەکی خۆی بەکارهێنا بۆ ئامۆژگاری کاریگەر و پێویست، بەڵام ئەوان ڕێزی ئەو ئامۆژگارییەیان نەگرت و وازیان لە کاری سەرپێچی و زوڵم و زۆری نەهێنا، ئەم کارانەش وادەخوازن کە پەنا بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی ببرێت بۆ پەرتەوازەکردنیان و هێنانەوەیان بۆ سەر ڕێگای ڕاست، بەڕاستی فەرماندەی ناوبراو ئامانجەکەی لەمبارەیەوە پێکا، کارە خراپەکانیان، تەشەنە دەکات بۆ شوێنەکانی دیش، ئەمەش یانی دروستبوونی جۆرێك کێشە و گرفت بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی کارگێڕی ویلایەتەکە و، لەوەی کە دەبیسترێت و دەگوترێت، خەڵکی وان تەنیا بەشدارییان نەکردووە لە کاری سەرپێچی و دووبەرەکی، بەڵکو لە نێوان (خان مەحمود و نوورەڵا بەگ و بەدرخان بەگ)دا هاوپەیمانییەتی بەستراوە و، گومان دەکرێت کە (شەریف بەگ)ی قائمقامی موش بەشداری لەگەڵدا کردبن و، حەسن ئەلئەعوری کوری ناوبراو لە میسرەوە ڕای کرد بۆ ئەو شوێنە، لە لایەن بەرپرسانی ناوبراوەوە ڕێزێکی زۆری لێ گیرا و چاودێری کران،

ئەو ئێستا هەوڵ دەدات بۆ جووڵاندنی لایەنەکانی وان و ئەجارە، بە تێڕوانین لە هەموو ئەو گۆڕانکارییانە دەردەکەوێت کە ئەم کارانە ئاسان نین، بەڵکو لە کارە هەرە گرانەکانن و، لە بەشی یەکەمی ڕاپۆرتی ناوبراودا هاتووە، ئەو هاوپەیمانییەتەی لە نێوان هەر یەك لە مستەفا بەگ و خان مەحمود و نوورەڵا بەگ و بدرخان بەگدا بەستراوە، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی هەر یەکێکیان بە سزادانیان لە لایەن دەوڵەتەوە، ئەوان هاوکاری یەکدی دەکەن لە بەرپەرچدانەوەی دەوڵەتدا، لەبەر ئەوە وا دەبینرێت کە لیوای (موش) بە ویلایەتی (وان)ەوە بلکێنرێت و، ناردنی فەرمانەکە بۆ (بەحری پاشا) بە پلەی وەزیر و ناردنی فەرمانی قەزاکانیش کە بەردخان بەگ بەڕێوەی دەبردن بۆ پاشای ناوبراو بە پلەی فەریق لە سوپای هۆمایونیی ئەنادۆڵ و، هێنانیان بۆ ناوچەکە لەگەڵ بەشێك یان دوو بەش لە سەربازی نیزامی بە هەموو کەلوپەلێکی سەربازییەوە و، هەڵسوکەوتێکی دانایانە بەرامبەر خەڵکی بکرێت بۆ دڵنیاکردنەوەیان، بەمەش بە پشتیوانیی (خوای گەورە) مەبەستی دیاریکراو دێتەدی بەبێ ئەوەی پەنا بۆ بەکارهێنانی هێز ببرێت.

بەڵام ئەگەر ئەو ئامانجە نەهاتەدی، ئەوا داوایەك بەرز دەکەینەوە لەسەر ڕێگاپێدان بە بەکارهێنانی هێز، لەمەشدا کارێکی پێچەوانە دەردەکەوێت ئەگەر ڕاپۆرتەکە ئەوەی ڕوون نەکردبێتەوە کە دانانی ناوبراوان و گەیشتنیان بە مەڵبەندی کارەکەیان ڕانەگەیاندبێت، هچ قەناعەتیان نەبوو بەو دڵنیایی و پاراستنەی کە پێیان دەدرێت، بۆیە کاری زوڵم و سەرپێچی زیادی کرد و، لەو کاتەدا پەنا برایە بەر بەکارهێنانی هێز، کەواتە لە دوای ئەوە دەتوانرێت داوای یارمەتی سەربازییان لێ بکرێت و، ئەگەر ژمارەی سەربازی پێویست بەکار نەهێنرێت ئەوا کاری زوڵم و ستەم و سەرپێچی پەرە دەسێنێت و بڵاو دەبێتەوە بە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا و دەگاتە نێو ئەنادۆڵ، بەتایبەتی ئەگەر لە ناوچەکانی (سیواس) بڵاوبێتەوە، ئەو کاتە دەبێت چ هەنگاوێك بنێین و چۆن هەڵسوکەوت بکەین و، هەتا ئەگە پێنج هەزار سەربازی نیزامی بنێرین لە گەڵ دەستەیەك یا دوو دەستەی سەربازی نیزامیی سوڵتانی و پێنج سەد یان شەش سەد سەربازی سوارە نیزامی دی هێشتا هەر بەس نییە و بەش ناکات، بۆ نموونە، ئەگەر بارودۆخی ئێستای بەدرخان تەماشا کەین دەبینین ئەو هێز و دەسەڵاتێکی زۆری هەیە، کە بە هۆی ڕیابازی و دادگەرییەوە بەرهەمی هێناوە، دەبینین تەمێکردنی ئەم لایەنانە

هەرسێکیان پێویستی بە بیست هەزار سەرباز کەمتر نییە و، بە هۆی ئـەو شـارەزایی و توانا و لێهاتووییەی کە هەریەکـە لـە عتوفـەی حـافیز پاشـا و براکـەی بـەحری پاشـا هەیانبوو بە هۆی ئاگاداریی تەواویان بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا، فەرمانـدەی نـاوبراو پرسیاری کرد، ئەم ناوچەیە بە بۆچوونی ئێوە هێزی سەربازی چەندی پێویسـتە؟، لەگـەڵ ئەوەشدا بەحری پاشا دڵنیابوو کە بە شێوەیەکی پێویست بەو کارە هەڵدەستێ، ئـەویش وەڵامی دایـەوە کـە ڕێکخسـتن و چـاودێریکردنی (وان) و دەوروبـەری بـووە بـە کـاری پێویست، ئەمکارەش پێویستی بە زیاتر لە بیست هەزار سەربازی نیزامی هەیە.

ئەگەر بە یارمەتیی (خوای گەورە) و گەورەیی حەزرەتی مەولانا سوڵتان ئـەم هێـزە ئامادە بکرێت، ئەو کاتە پێویست ناکات هێزی زەبر بەدەست بەکاربهێنین بۆ چاکسازیی ئەو ناوچانە، برا ناوبراوەکەی کەمتەرخەمی نەکرد لـە دەرخسـتنی دڵسـۆزی و هـەوڵ و هیممەتی خۆی و پشتگیری هەموو ئەو شتانەی کـرد، کـە لـە لایـەن سـەرۆکایەتییەوە دەرچوو بوو و، لە ڕاستیدا ئەوەی کە لـە وەرەقەکـەدا هـاتووە، دەڵێـت دەسـتکردن بـە ئەنجامدانی ئەمکارە بـە بـەکارهێنانی هێـزی ناتـەواو، لـە گـەڵ ڕای ئەنجوومەنەکـەدا نایەتەوە و، لە هەموو بارودۆخەکاندا ئەو لێکۆڵینەوەی خۆی ئـەنجام داوە لـەبارەی ئـەو بارودۆخەی کە هەیە، ئەنجامەکەی نووسینی وەڵامنامەیەکە لەسەر ڕاپۆرتەکەی ئەسعەد پاشا بۆ ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە باسی لێوە کردووە.

لەگەڵ ئەوەدا ئەو بابەتەی کە باسمان کرد دەربارەی ئەو بارودۆخانە لە دواییدا بە پێی پێویست باسیان لێوە دەکەین، لە گـەڵ ئەوەشـدا بابـەتی نامـەی کونسـوڵی بـەریتانی تێروتەسەل بوو و لە شوێنی خۆیدا لە دوای ئەوەی هەندێ وشەی نەگونجاومان لێ لابرد، بەبێ ڕوونکردنەوەی لـە لایـەن ئـەو لایەنـەی کـە نامەکـەی لـێ دەرچـووە وێنەیـەکی دەنێردرێت بۆ لایەنەکەی دی، هەرچەندە بۆ وەڵامەکەی گرفت دروست ناکـات، چـونکە هەموو بیروبۆچوونە خراپەکانی هەریەکە لە خان مەحمود و نوورەڵا بـەدرخان بـە گشـتی تێیدا زانرابوو دوای ئەوەی سـوپای ئـەنادۆڵی هومـایونی بـە هـەموو پێداویسـتییەکی سەربازییەوە ئامادە کرا بۆ هێنانـەدیی ئامانجـەکان بڕیـاربوو کـە بـەدرخان بـەگ لـەو شوێنانە دوور بخرێتەوە، ئەنجوومەنەکە وای بینی کە تەمێکردنی خەڵکی وان و بەدرخان بەگ بە هۆی سوڵتانی گەورەمانەوە یەکێك بوو لە هەرە کارە پێویست و گونجاوەکـان و،

هێنانەدیی ئامانجی پێویست تەنیا (وان)ی نەگرتەوە، بەڵکو هەردوو لای دەگرتەوە، کارەکە کارێکی گەورە بوو، بۆیە پێویست بوو ڕێوشوێنی گەورەشی بۆ دابنرێت، لە ڕاستیدا لە ئەرزرۆم نێزیکەی پێنج هەزار سەربازی نیزامی هەبوو و، هەروەها ناردنی بەشێك یان دوو بەش لە سوپای نیزامی کارێکی ئاسانە، بەڵام پێویست بوو لەو هۆکارانە بگەڕێین کە بەدرخان وا لێ بکات نەترسێ لە هاوکاریکردن لەسەر کێشەی (وان)، لەو کاتەدا دەنێردرێت بۆ لەسەر کارلادان و دەرکردنی هەریەکە لە خان مەحمود و نوورەڵا بەگ و شەریف بەگ بە هۆکارێك لە هۆکارەکان، بەڵام ئەگەر ئەوەی پێ نەکرا، ئەوا ئەو هێزە سەربازە ئامادە کراوە بەس نییە بۆ هەستان بەمکارە، کە هەریەکە لە وەزیر و گەورەیەکی لەسەر دانراوە کە لەبەشی یەکەمی ڕاپۆرتەکەدا ناردمانن بە گەیشتنیان بۆ شوێنی مەبەست کار دەکەن لەسەر ئارامکردنەوەی ناوچەکە و دڵنیاکردنی خەڵکەکە، ئەگەر ئەمە کاریگەری نەبوو، ئەوا وا دەکەن پەنا ببرێتە بەر بەکارهێنانی هێز، بەڵام تا هێزی تازە پێیان دەگات، ئەوا سەرپێچیکاران بەردەوام دەبن لەسەر خراپە و تەشەنەسەندن بۆ ناوچەکانی دیش، وێدەچێت ئەو بارودۆخە کارەساتی دڵتەزێنی بۆدەوڵەتی عوسمانی لێ بکەوێتەوە، بۆ هێنانەدیی بەرژەوەندییەکان دوو ڕێگە هەیە:

یەکەمیان: هەستن بەو کارەی کە پێویستە جێبەجێی بکات لەکاتی ئەگەری ناوبراودا.

دووەمیان: بەخشینی ئەمان و دڵنیایی بە خەڵکی ناوچەکە.

ئەو ڕوونکردنەوانەی کە باس کران هەموویان بینران و جێبەجێکردنیان لەسەر کات و شوێنی گونجاو دەوەستێت، لە پاشاندا ئەو پرسیارانە دێتە ئاراوە، ئایا دەتوانرێت کێشەی وان یەکەجار چارەسەر بکرێت؟ ئایا دەتوانرێت لە دواییدا لایەنەکەی دی تەمێ بکرێت، لە کاتی جووڵەی سەربازیی هاوکات لە بەرامبەر هەردوو لادا، ئایا ئەو هێزە سەربازییە دیاریکراوە بە تەنیا بەسە بۆ ئەم مەبەستە؟ ئەگەر هەوڵ بدرێت ئەو وەزیر و گەورەیەی کە پێشنیارمان کردوون بیاننێرین لێرەوە هیچ کاریگەرییەکیان نابێت، وا پێویست دەکات لەو کاتەدا هێندە ئەملاولا نەکرێت، بە هۆی هەستنەکردنیان بە پێویستیی تەواوکردنی ئەو هێزەی کە ئەم کارە دەکات، لە ڕاستیدا ئەو شێوەیە

بەرژەوەندییەکانمان دێنێتەدی، بەڵام ئەگەر وا نەبوو و، لە لای ئەو دوو کەسەی کە باسمان کردن (مەبەست وەزیر و گەورەکە. و.) هێزی تەواو نەنێردرا و لە کاتێکدا داوا کرا، هەموو هێزەکە بنێردرێت، ئەگەر سەرپێچیکاران بەرهەڵستییان کردبێت لە شوێنی نێزیکبوونەوەمان لێیان، ئایا دەرئەنجامی خراپی زیاتری لێ ناکەوێتەوە؟ بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو داوایەمان بداتەوە لە ناردنی هێزی پێویست بۆ ئەمکارە، ئایا دەتوانرێت بە پێدانی ئارامی و دڵنیایی کاریگەر بێت بە شێوەیەکی کاتی؟ تکایە بەخێرایی ڕای خۆتان دەربڕن و ڕوونکردنەوەی پێویست بدەن لە بەرامبەر ئەو پرسیارانەدا.

بە تێڕوانین لەو هەوڵەی کە درا بۆ بانگهێشتکردنی(حسێن بەگی ئەعوەر) بۆ ئەرزڕۆم و ئەو بەڵێنانەی کە پێی دران، (( وا هەست دەکرێت کونسوڵی ڕووس بەکاری بهێنن))، ئەگەر ئامانجی ناوبراو بریتی بێت لە دەستبەسەرداگرتنی بەو شێوەیە، ئەوا ئەنجوومەن لە ڕێگەی چاودێری دەرەکییەوە هەوڵی داوە ئەوە بۆ سەفارەت لێکبداتەوە، لەگەڵ ناردنی نووسینەکە بۆ فەرماندەی ناوبراو و، هەروەها ئەنجوومەن دووبارەبوونەوەی گفتوگۆکانی پێشووتر و خوێندنەوەی جارێکی دی لەنێو بریکارەکاندا بینی و لەگەڵ ئەوە خستییە بەردەم مەقامی باڵا، هەموو ئەو سەرنجانەم تۆمار کرد و، پاشان جارێکی دی خستمەوە بەر دەستی ئەنجوومەنی گشتی کە ڕۆژی یەکشەممە بەسترا، وای بینی کە ئەو کارانەی باسیان کردوون لەگەڵ گفتوگۆکان و بریکارەکانی دانیشتنی پێشوو وەکو یەکن و، هەروەها ئەو نووسینەی کە خرایە بەردەم سەفارەتی بەریتانیا دەربارەی ئەو هەڵسوکەوت و دەستدرێژییانەی کە لە لایەن قائمقامی موش (شەریف بەگ)ەوە ئەنجام دەدرا بینرا، ئەنجوومەنەکە ڕوونی کردەوە کە قائمقامی ناوبراو بە کەسایەتییەکی ڕاڕا و ناجێگیر ناسراوە، ئەوەی کە باس کرا لە هەڵسوکەوت و دەستدرێژی ئەوا مەقامی باڵا پێی قایل نییە، ئەنجوومەنەکە وای دەبینی کە بەرژەوەندی لەوەدایە ئەو نامەیەی پێشووتر بنێرێت بۆ کونسوڵی ئینگلیز لە ئەرزڕۆمەوە بۆ ئەسعەد پاشا، لەبەر ئەوەی کونسوڵی ناوبراو خۆی وای دەخواست و، بڕیار درا ئەو نووسینانە بۆ لای مەقامی باڵا بەرز بکرێنەوە تا چاویان پێدا بخشێنرێتەوە، ئەو بیرخەرەوەیەم نووسی بۆ سووربوونمان لەسەر جێبەجێکردنی ئەوەی لەمبارەیەوە لە ئیرادەی سونەییەوە دەردەچێت.

**١٧ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٦٢(١٨٤٥ز)**

**MM/22314**

**بۆ مەقامی باڵا:**

به مەبەستی چاوخشاندن بەو نامەیەی کە دەربارەی گەڕانەوەی والیی سیواس (ڕەشید پاشا) بۆ تەرابزون و هەندێ دانپێدانانی ناوبراوی تێدابوو هاتووە، بەوەی ناوبراو دانی نا بەوەیدا کە ئەو سەربازە نیزامیانەی کە تایبەت بوون بە کارکردن لەگەڵیدا گەڕانەوە بۆ ڕێکخستنی هەندێك کاری دیاریکراو لە لایەن سوڵتانەوە و، کارکردن بۆ بەرژەوەندیی هەندێ لە کوردەکان و خێڵەکان، لەگەڵ ئەوەدا دەستگرتن بەسەر ئەو کەسانەی کە بە فەرمانڕەواکانی (زرقی)[20] ناسرابوون، بەندکردنیان بە هۆی هێزی مەولانا سوڵتان لەو شوێنانەدا، ئەوەش کارێکی گونجاو نەبوو بۆیە هەموویان بۆ سیواس ناردن، تاوەکو فەرمانێك دەربارەیان لە لایەن ئیرادەی سونییەوە دەردەچێت، لەڕاستیدا بەندکردنیان لەو شوێنەدا شتێگی گونجاو نەبوو، لەبەر ئەوەی لە گەورە خراپەکارەکانی کورد بوون، بۆیە وای دەخواست کە بۆ ناوچەکانی (روملی) وەك (فارنا و ڕوسجق و...هتد.) بنێردرێن، لەو شوێنە گونجاوانەدا نیشتەجێ بکرێن، هەروەك باس دەکرێت ئەمانە لە دەوڵەمەند و چەپەکانن و، هەر لە کۆنەوە خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆر بوون، پێویستە ئەو ماڵ و سامانە زۆرە تۆمار بکرێت و، بەشێکی بۆ ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵ و کەسوکاریان تایبەت بکرێت و، ئەگەر منداڵانی کورد گوزەرانیان بۆ دابین بکرێت لەسەر ئەو شێوەیەی داواکراوە لەگەڵ ئیرادەی سوننی دێتەوە، کەواتە تکایە بفەرموون بە ئاگادارکردنەوەمان.

**خاوەنی دەوڵەتە بەسۆز و گەورە و بەڕێز و بەخشندەکەم:**

ئەو یاداشتنامەیەی کە نامەکانی ڕەشید پاشای لەخۆ گرتبوو لە لایەن مەقامی حەزرەتی سوڵتانەوە بینران و، قایل بوو لەسەر ناردنی ئەو خراپەکارانەی کە بە فەرمانڕەواکانی (زرقی) ناسرابوون، بۆ (رومیلی) و نیشتەجێکردنیان لە (فارنا) و، والیی ئاماژەپێکراو ئاگادار بکەنەوە بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست.

---

(٢٠) مەبەست میرنشینی (زرقی)ە، کە لە ناوچەکانی نێوان دیاربەکر و ماردین فەرمانڕەوایی کردووە، ئەویش بەسەر سێ میرنشینۆکەدا دابەش بووە، کە بریتی بوون لە(درزینی و هتاخ و ترجیل)، بڕوانە: **سعدی عثمان، کوردستان والامبراتورية العثمانية**، ص٢٦. و.

## (( بەڵگەنامەکان لەسەر عیزەددین شێر ))

### A.MKT.UM210/48

لەسەر ئەوەی کە بە موتەسەڕیفییەی موسڵ سەعادەت حیلمی پاشا گەیشتووە لەوەی کەوا عیزەددین شێر و براکەی مەنسور بەگ و سەعید بەگ و ئیبراهیم بەگ شێروانی لەگەڵ هەندێ لە هاوکارەکانی خۆیان داوەتە دەست عارف بەگی ئەمیر ئالاّ لە سوپای هومایونیی عیراق لە موسڵ، تا لە موسڵ دەریان بهێنێت بە پێی ئیرادەی سوننی کە لەمبارەیەوە دەرچووە.

لەبەر ئەوەی ئەو شوێنانەی کە ئەو ناوبراوان پیایدا دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و بە بیابانەوە بەستراوەتەوە، بۆیە ئامۆژگاریی تایبەت و پێویستم دا بەو ناوچانە، هەروەکو ژمارەیەك لە سوارەم بۆ لای نسیبەین نارد و توانرا ناوبراوان لە ژێر پاراستن و چاودێریدا بە ئاسانی بۆ دیاربەکر بهێنرێن.. ئەوان لە دوای ئەو ڕێکەوتەوە بە یارمەتیی خوای گەورە بۆ خانەی سەعادە دەنێردرێن، فەرمان بۆحەزرەتی وەلی ئەمرە.

٢ی محەڕەمی ساڵی ٧٢ (١٨٥٥ز)

والیی ویلایەتی کوردستان: ئەحمەد عیزەت

### A.MKT.UM 210/48

سەعادەت حیلمی پاشای موتەسەریفی موسڵ پێی ڕاگەیاندم، ئیرادەی سوننی وا دەخوازێت کە عیزەددین شێربەگ کە لە موسڵ دەستبەسەرە، بە هۆی هەڵگەڕانەوەی دژی دەوڵەت بۆ خانەی سەعادە بنێردرێت و، بە هۆی پێوەندی لە گەڵ دەوڵەت پاشای والیی بەغداد فەرماندەی سوپای هومایونیی عیراق و حیجاز، ئەمیر ئالاّی عارف بەگی سوپای هومایونی ڕاسپارد بە گەیاندنی بە شوێنی ناوبراو، بەلاّم بە هۆی هەندێ مەترسی ناوچەیی لەو شوێنەدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی لە گەڵ ئەمیر ئالاّ نارد بۆ هێنانی ناوبراو و هاوکارەکانی لە موسڵەوە و، ناردنیان بۆمان و، دەوڵەت پاشای والیی

کوردستان داوایەکی نارد بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بە مەبەستی بە سەلامەتی گەیاندنیان بۆ دیاربەکر، بۆ ئەو مەبەستە نێزیکەی (١٥٠) سەرباز نێردران، دوای ئەوەی هەواڵ درا لەسەر جووڵەی ئەمیر ئالاّ لە موسڵەوە و گەیشتنی بە شوێنی(دیسیخابوور)ی نێزیك زاخۆ، لیوای ماردین ڕێوشوێنی بەپەلەی گرتەبەر، چونکە ئیرادەی سوننی وا دەخوازێت کە بە سەلامەتی و دڵنیاییەوە بگەن، بۆیە پێویستە لە کاتی ئەنجامدانی ئەم کارەدا هەموو ڕێوشوێنێکی گونجاو بگیرێتەبەر تاوەکو بواری ڕاکردنیان نەبێت، چونکە ماوەی نێوان دیسخابوور و ماردین هەشت قۆناغە ڕێیە و ڕێگاکەی دیکەیش بە بیابانەوە لکاوە، سەرباری ئاگاداربوون لە مەترسیی ئەو خراپەکارانەی کە هاوشێوەی ئەوان بەردەوام لەو ماوەیەدا خەریکی ئەنجامدانی کاری تاوان بوون و، لایەنەکەی دی شاخی جزیرەی بۆتان بوو کە شوێنی کۆنی میری ناوبراو (عیزەددین شێر و.) بوو، ئەویش لە مەترسی دوور نەبوو، بۆیە نێزیکەی سێسەد سەربازی لە سەربازەکانی بیابان نارد بۆ (جللغە) تا پێشوازیمان بکەن و، یەکسەر لە ماردینەوە دەستم کرد بە ڕۆیشتن، هەموو ئەو سوارانەی کە لە دیاربەکرەوە هاتبوون لە گەڵمدا بوون و، ئەو سەربازە پێڕۆ و سوارانەش کە لەوێ بوون ئامادە کرابوون بە هەموو کەلوپەلێکی سەربازییەوە بە تۆپ و ئامێری گرینگ و کەلوپەلی یەدەگی بیابان و، پێشوازیم کرد لە ئەمیر ئالاّی ناوبراو و بردم بۆ گوندی (کدللی) کە دوو کاتژمێر لە ماردینەوە دوور بوو، لەوێ ئەو سەربازانەی کە لە موسڵەوە هاتبوون گەڕێندرانەوە بۆ شوێنی خۆیان، بە قودرەتی حەزرەتی مەولانا سوڵتان و گەورەی مەقامی سەدارەتی لە گوندی(کدللی)یەوە بە کۆمەڵێکی زۆر لە سەربازەوە ڕۆیشتن بە پشتیوانیی (خوای گەورە) توانیمان بە گەروی تورکماندا لە سەر ڕێی شێخان بپەڕینەوە، بە تەواوی و بە ساغ و سەلامەتی لە زەوییەکانی ماردین دەرچووین، بە سەلامەتی گەیشتینە گوندی (خانیك)ی سەر بە دیاربەکر، لەوێ ئەمیرئالاّی ناوبراوی نارد بۆ دیاربەکر، دوای ئەوەی کە ژمارەیەکی تەواوی لە سەربازی پێڕۆ و سوارەی سەر بە ماردینی لە گەڵدا نارد لە گەڵ ئەو سەربازانەش کە لە دیاربەکرەوە هاتبوون، بۆیە میری ناوبراو و دارودەستەکەی هیچ ڕێگەیەکیان بۆ هەڵاتن لە نێو لیوای ماردیندا نەدۆزییەوە و، لە ڕێگادا هیچیان تووشی تەنگاوی و نارەحەتی نەبوون، ئومێدەوارین کە ڕۆژێك دوای ڕێکەوتی ناردنی

نامەکەم بە سەلامەتی بگەنە دیاربەکر، ئەو ڕاپۆرتە ئامادەکرا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێویستە بکرێت، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمری چاکەکارە.

**سەرەتای محەڕەمی ساڵی ٧٢ (١٨٥٥ز)**

**قائمقامی لیوای ماردین**

**A.MKT.UM 210/48**

**18.M.1272**

به تێڕوانین لەو داوایەی کە لە کونسوڵخانەی ئینگلیزەوە لە موسڵەوە هاتووە، لەبارەی ئەوەی کە دەوڵەت (عیزەددین شیربەگ) بگرێت لەو کاتەدا کە لە کونسوڵخانەی ناوبراو بوو، کێشە لە نێوان ئەو و مەلیکی ناوبراودا هەبوو کە وەك کەسێکی هاوکار بوو بۆی، بە هەموو جۆرە کارێکی خراپ و قێزەونەوە، بۆیە دەبێت ئاگاداری مانەوەیان بین لە کونسوڵخانە و، بە پێی ئەوەی کە لە داواکاریی کونسوڵییەدا هاتووە جەخت بکرێتەوە لەسەر ئەو ئاگادارییە لە کاتی دەستبەسەرداگرتنیدا[٢١] تاوەکو هیچ مەجالێك نەمێنێتەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە دواییدا، بۆیە پێویستە ڕەزامەندی بدرێت لەسەر داوای کونسوڵی ناوبراو، بەڵام ناوبراو وەرگێڕەکەی خۆی نارد تا پێیان بڵێت ئەگەر دەسەڵاتداران پێش دەرچوونی فەرمانی دەوڵەتی سوننی داوای لێ بکەن ئەوا ڕادەستی ناکات، دوای ئەوەی ناوبراو ڕازی بوو هاوەڵێکی کارمەندی نارد لە گەڵی بۆ مەڵبەندی ڕێکخستن شاردا و، کونسوڵ تکای کرد لێیان کە ناوبراو ڕووبەڕووی هیچ سزایەك نەبێتەوە، لە پێناوی داوای کونسوڵ ڕێوشوێنی پێویست گیرایەبەر، بە چاوپۆشین لەو بەندکردنە توندەی کە ڕێگەدەدرا بە چوونەلای و خزمەتکردنی لە کاتی بەندکردنەکەیدا و، هەروەها ڕێگەی پێ درا کە وڵاخەکەی لە یەکێك لە شوێنە کەلاوەکانی شاردا ڕابگرن، بەڵام ئەو کەسێکی نارد کە چەکی لە نێو (کا)دا لەو

(٢١) کونسوڵخانەی بەریتانیا ڕۆڵی گرینگی گێڕا لە خۆبەدەستەوەدانی یەزدان شێر، بەتایبەت جێگری کونسوڵخانەی موسڵ (کریستیان ڕسام)، پاشانیش ڕادەستکردنی بە عوسمانییەکان و گواستنەوەی بۆ ئەستەمبول، بڕوانە: عەلیاوایی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، ل٨٠. و.

کەلاوەیەدا بۆ شاردەوە و، یەك ڕۆژ پێش گەیشتنی فەرمانی باڵا بـە ڕادەسـتکردنی نـاوبراو نێزیکەی کاتژمێر حەوت لە گەڵ یەکێك لە پاسەوانەکانی بـە مەبەسـتی خۆشـاردنەوە ڕووی کردە کەلاوەکە، لە کاتێکدا کە پاسەوانەکە لەبەر دەرگا چاوەڕوانی دەکرد، ئەو، ئەو چـەکەی کە لە نێو کادا شاردرابووەوە دەریهێنا و سواری ئەسپەکەی بوو و بە خێرایی بۆی دەرچـوو و، بە چەکەکەی ڕووبەڕووی ئەوانە بووەوە دەیانەویست بیگرن و، بە هۆی خێرایی ئەسـپەکەیەوە نەگیرا و بەرەو بیابان کەوتە ڕێ و هەڵات، زانیم کە خزمەتکارەکەشی سواری ئەسـپ بـووە و پێی گەیشتووە و، ژمارەیەکی زۆر لە سەربازمان نارد بۆ هەر چوار لا بۆ دەستگیرکردنەوەی، بەڵام ناوبراو زۆر دوورکەوتەوە و هیچ شوێنەوارێکی نەما.

سوارەکان شەو و ڕۆژێك بە دوای کەوتن و چاودێریی ناوچـەکەیان کـرد و وڵاخـەکان زۆر ماندوو بوون و سەربازەکانیش چی تر بەرگەی برسییەتی و تینویەتییان نـەگرت و گەڕانـەوە، بەڵام هەندێکیان سـووربوون لەسـەر دۆزینـەوەی، چـونکە وڵاخـەکانیان ڕاهـاتبوون لەسـەر نارەحەتیی بیابان، تا دواجار گەیشتن بە ناوبراو دەستگیریان کـرد و هێنایانـەوە، ئـەو پیـاوە بەهای ئەو سەلامەتییەی نەدەزانی کە پێی بەخشراوە بۆیە هەڵات و، کونسـوڵی نـاوبراویش ئاگاداری ئەمەیە و بەندکردنی بەسەردا سەپاندەوە، ئەگەر ڕوودانی کێشـە و دووبـەرەکی لـە نێوان ناوبراو و ئەمیر ئامادەکراودا کـە زۆر لێـك نێزیـك بـوون، بۆیـە لێـك جیابوونـەوەیان شتێکی مەحاڵە، پاشان ڕادەستکردنی بۆ دەوڵەت ئینجا هەڵاتنی بەو شـێوەیەی کـە باسمـان کرد پەند و ئامۆژگاریی زۆری تێدایە، بۆیە دەسـتگیرکردنی یـەکێك بـوو لـە بەرهەمـەکانی سەرکەوتن و بڕوا پێبوونی پایەبەرز بەو پیاوانە، ئێمە هەر سوور بووین لەسەر چـاودێریکردن و پاراستنی لەسەر داوای کونسولی ناوبراو، کە وەك میوانێك دادەنرا لای دەوڵەت، بەڵام ئەو ئەم مەرجانەی پێشێل کـرد و خـەڵکێکی زۆری کوشـت و مـاڵی زۆر کەسـی خـوارد، بـەو شێوەیەی کە خستمانە ڕوو لە بەشی هەژار و بێ دەسەڵاتەکاندا لـە کوردسـتان بـۆ دەوڵـەت پاشا والیی ولایەت، بڕیار وایە ناوبراو و هاوکارەکانی لەو ناوچەیە دەربهێـنین دوای سـێ ڕۆژ لە ڕێکەوتی ئەو ڕاپۆرتەدا و، جێبەجێکردنی کاری پێویست پەیوەستە بە ڕای بەرێزتانەوە...
فەرمان لە هەموو بارەکاندا بۆ وەلی ئەمری چاکەکارە.

**١٤ی سەفەری ساڵی ٧١**

**موتەسەریفی موسڵ: محەمەد حیلمی**

**A.MKT.UM210/14**

وەك ئەوەی لای مەقامی سەرۆکایەتیی باڵا ئاشکرایە، ئەو دوو ڕێنماییەی کە لە لایەن دەوڵەت حەمدیی پاشای والی کوردستانی پێشووەوە بۆم هاتووە، بە مەبەستی کارکردن لەسەر دانانی سنوورێك بۆ ئەو دووبەرەکی و ئاژاوەیەیی لەسەر دەستی عیزەددین شێر بەگ لە ساڵی ڕابردوودا لە کوردستان ڕووی دا، هەستام بە بردنی هەزار و پێنجسەد سوار و سەد و پەنجا سەربازی پێرۆ بۆ شوێنی مەبەست و، هەستاین بە باشترین شێوە لەسەر جێبەجێکردنی ئەو شتانەی کە پێویستن، هەتا ئاژاوەکە کۆتایی هات.

ئەو پیاوانەی کە وڵاخ و چەکەکانیان لە جەنگدا تێداچوون هەستام بە پێدانەوەیان، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵ و کەلوپەلم لە ساڵی ڕابردوودا لە کاتی شەڕدا لە گەڵ کوردەکان تێداچوو، دوای ئەوە پەیمانی پێ درا لە لایەن سوڵتانەوە بە نیشانە و پلەیەك وەك ئەوەی بەخشی بە من و هاوشێوەکان[٢٢] بەڵام نەزهەت ئەفەندی دەفتەرداری کوردستان وەکو ڕقێك لە من هەستا بە کەمکردنەوە و بڕینی سەد و شەست هەزار قروش لەو مووچەیەی کە پیاوەکانم وەریان دەگرت، لەوکاتەدا بوو کە خزمەتگوزارییەکانی حەمدی پاشا نەما و تەواو بوو، بەو شێوەیە تووشی زوڵم و ناڕەحەتییەکی زۆر بووم و، بە هۆی ڕازینەبوونی سوڵتان بە زوڵمکردن و کاری لەم شێوەیە، هەستام ماڵ و منداڵم لە موسڵ جێهێشت و، هەندێ لە پیاوەکانیشم لە دیاربەکر و ئوماسیە و ئاژەڵەکانم لە (سامسون) جێهێشت و، چوار مانگ پێش ئێستا گەیشتمە بارەگای خاوەن سۆز و بەزەیی سوڵتان هەتا مافی خۆم بۆ بگێڕێتەوە، ئەویش داواکەی نارد بۆ ناوبراو (حەمدی پاشا) بە یاداشتنامەیەکی گرینگ تا ڕاستەکەی بۆ

---

(٢٢) دەوڵەتی عوسمانی بە مەبەستی هاندانی ئەفسەر و سەربازانی سوپا بۆ دامرکاندنەوەی جووڵانەوە و ڕاپەرینی میرە کوردەکان، بەتایبەت دوای سەرکەوتنەکانیان پلەوپایە و نازناو و مەدالیای تایبەتی پێ دەبەخشین، وەك ئەوەی بە بەشداربووانی دامرکانەوەی جووڵانەوەی بەدرخان پاشای بەخشی بەناوی (مەدالیای شەڕی کوردستان)، یان ئەوەی بەو ئەفسەر و سەربازانەی بەخشی دوای سەرکەوتنیان بەسەر جووڵانەوەی یەزدان شێردا، بڕوانە: عەلیاوایی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، ل٤٤، ل٨٠. و.

ڕوون بکاتەوە، ئەویش وەڵامەکە پشتگیری داواکە بوو و بە ڕاستی دانا، بەڵام وەکو زانراوە دەڵێن دوژمن قورئان لەسەر دوژمن ناخوێنێ.

دەرکەوت دەفتەرداری ناوبراو لەسەر مافی خۆم داشکاندنی زیادەی کرد کە پەنجا هەزار قروش بوو، بە هۆی چوونم بۆ کۆشکی پاشایەتی، دەفتەردار لەو کاتەدا سەرۆکی ئەنجوومەنەکە بوو، شتێکی ئاسایی بوو کە دژی قسەکانی من قسە بکات بە هۆی ئەو سکاڵایەی کە دژی ئەو بەرزم کردەوە، لەگەڵ ئەوەدا من لێرە و لەوێ ئەو ئەندازە پارەیەم بۆ سەربازەکان دانا کە لە کونسوڵەکان قەرزم کردبوو و، هەرچی لە توانمدا هەبوو بەکارم هێنا بۆ گێڕانەوەی مافەکانیان، لە گەڵ ئەوەدا من ئێستا ڕووبەڕووی زۆر نارەحەتی دەبمەوە، لە لایەن ئەوانەی کە قەرزم لێ کردوون و، هەروەها کونسوڵەکان هەڕەشەم لێدەکەن بەوەی کە سکاڵام پێشکەش بە سەفارەتەکانیان کردووە.

لەسەر ئەوەی کە خستمەڕوو تکام وایە ئەو ئەندازە پارەیەی کە بە پێی ڕێنماییەکان داوای دەکەم بۆم خەرج بکەن، جاچ لە لایەن خەزنەداری بەڕێزەوە یان هەر لایەنێکەوە بێت، چونکە لەگەڵ دادگەری سوڵتاندا نایەتەوە و بەم بارودۆخە خراپەش ڕازی نابێت کە خۆم و ماڵ و منداڵم تێی کەوتووین، تکام وایە ئەو نیشانە و پلەیەی کە بەڵێنتان پێدام پێم ببەخشن، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

سەرکردەی پێشووی سوپای ویلایەتی کوردستان

ئیبراهیم گورجی زادە

## A.MKT.UM221/14

### بۆ بەڕێز والیی کوردستان:

لەو داوایەی کە ئیبراهیم ئاغای گورجی پێشکەشی کرد، ئەوەی تێدا ڕوون کردەوە کە دەڵێت، لەسەر ئەو ڕێنمایی و زانیارییانەی کە بۆم هاتن لە لایەن دەوڵەت حەمید پاشای والیی پێشووی کوردستانەوە، داوای دانانی سنوورێکی بۆ ئاژاوەیەی کە عیزەددین شێر بەگ ساڵی ڕابردوو لە کوردستان بەرپای کردبوو، هەستا بە ناردنی هەزار و پەنجا سوارە و سەد و پەنجا سەربازی پیێرۆ بۆ ئەو شوێنانەی کە پێویست بوون، ئەوەی داوای لێ کرابوو جێبەجێی کرد و بە باشترین شێوە ئاژاوەکە کۆتایی هات، هەروەها

هەستا بە پێدانەوەی ولاخ و چەك بەو کەسانەی کە لە کاتی شەڕدا ولاخ و چەکەکانیان فەوتاوە و، ژمارەیەکی زۆریش ئاژەڵ و شتی دی فەوتا و نەما لە کاتی شەڕ لە گەڵ کوردەکاندا، بەڵام نەزهەت ئەفەندی وەکو ڕقێك لێم هەستا بە بڕین و کەمکردنەوەی نێزیکەی سەد و شەست هەزار قروش لەو مووچەیەی کە دارودەستەکەی وەری دەگرت و، دەفتەرداری ناوبراو بە هۆی هاتنی سکاڵاکار (واتە ئیبراهیم گورجی و.) بۆ خانەی سەعادەت هەستا بە دابەزاندن و کەمکردنەوەی حیسابەکەی کە نێزیکەی پەنجا هەزار قروش بوو تا مافی خۆی نەداتەوە، ئەویش هەستا بە قەرزکردن لێرە و لەوێ و لە کونسوڵەکان تا مافی سەربازەکان بدات، بۆیە بەم هۆیەوە ڕووبەڕووی ناڕەحەتی بۆتەوە ئێستا و، دەیەوێت مافی خۆی بدرێتەوە وەکو پێویست بەو شێوەیەی کە لە ڕێنماییەکاندا هاتووە و پێی دراوە، لە کاتێکدا ئەو کارانە پێویستە ڕێك بخرێت بە باشترین شێوە، داوای چاوخشاندنەوە بەداواکەیدا دەکات لە لایەن ئەنجوومەنەوە و گێڕانەوەی مافەکە بۆی.

**٦ی جەمادیی یەکەمی ساڵی ٧٢**

## A.MKT.UM 221/14

**بەڕێز فەرماندەی لەشکری هومایونی لە ئەنادۆڵ:**

ئەو بزووتنەوە هەڵگەڕاوەیەی کە عیزەددین شێر بەگ لە جزیرە و دەور و بەری پێی هەستا، ئاشکرایە لای هەموومان دوای گەڕانەوەی قائمقام (ساڵح بەگ) کە لە لایەن سوپای هومایونییەوە نێردرابوو بۆ ئاگاداریی بارودۆخ و گۆڕانکارییەکان، لەگەڵ پێدانی دڵنیایی و ئارامی بەو شوێنە، لە بەرامبەر ئەوەدا پێویستە ڕێوشوێنی پێویست بگیرێتەبەر بۆ کۆتاییهێنان بەو کێشەیە، ئەوەش پێویست دەکات سوپای نیزامی بۆ ئەوێ بنێردرێت، بەپێی شوێنەکە پێویستە ئەو هێزەی کە دەنێردرێت لە لەشکری هومایونی ئەنادۆڵ بێت، لە گەڵ ئەوەشدا لەشکری ناوبراو هیچ کاتێکی وای لەبەر دەستدا نەبووە تا سەرقاڵ بێت بە جەنگ دژی دوژمنێکی بەهێز، بۆیە بەرژەوەندیی دەوڵەت وا دەخوازێت کە بەدوای ڕێوشوێنی دیکەدا بگەڕێن، لە (سیواس) هێزێکی

سواره زۆر بە تەواوی ئامادە کرابوون و، هەرروەها لـە (حەلـەب) تابورێـك لـە سـوپای پێرۆی نیزامی تێدا بوو و، پێیان گەیاندین بە ناردنی سوپای نیزامی کە لە موسڵ بـوو، لە گەڵ ناردنی بەشێك لە سوارەکان لە بەغداد و دوو تـابور لـە سـەربازی نیزامـی لـە خانەی سەعادەتەوە، هەروەها هەموو دەسەڵاتێکم دا بە عیزەت پاشای والیی کوردستان بە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی تەواو لە سوارە و سـەربازی پێـرۆ لـە سـیواس و حەلـەب و هەموو لایەنەکانی دی، بەو شێوەیە ئەو سەربازانە هێزێکی گـەورە پێـك دەهێـنن، بـە یارمەتیی (خوای گەورە) و سوڵتانی گەورەمان والیـی نـاوبراو ڕادەسـپێرین ئـەم کـارە بکات بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵگەڕانەوەی ناوبراودا.

## (( بەڵگەنامەکان لەسەر بەدرخان بەگ ))

### Irade Mesail-Imuhimme 1240

**گەنجینەی ئەوراقی بابی عالی:**

لیستی هاوپێچەکانی تایبەت بە دەسەڵاتی سوننی (بە ویستی سوننی):

ژمارە ١٥ ڕێکەوتی ٤ی محەڕەمی ساڵی ٦٣ پوختە: لە بەدرخانییەکانەوە:

ئەوراقی هاوپێچ بە دەسەڵاتی سوننی:

١ نووسراوی والی سیواس ڕێکەوتی ١٩ی زیلحەجەی ساڵی ٦٣:

١ سپاردە (ڕاپۆرت):

١/٣ دانیشتنی ئەنجوومەنی باڵا، ڕێکەوتی ٢ی محەڕەمی ساڵی ٦٣ (١٨٤٦ز):

ئەنجوومەنی بریکارە تایبەتییەکان لە ڕۆژی دووشەممەدا چاوی خشـاند بەسـەر ئـەو یاداشتنامە و ڕاپۆرتە هاوپێچەی کە (ئەسعەد پاشا) والیی ئێستای موسڵ و ئەو نامـە تێر و تەسەلەی لە گەڵـدا بـوو، وەك وەڵامێـك لەسـەر نووسـراوەکەمان و، بـۆ هـەموو کەسایەتییەکان بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ڕێوشوێنی ناوچەیی و بیر و ڕای شەخسی بە شـێوەیەکی نهێنـی دەربـارەی تـەواوکردنی هۆکـارە پێویسـتەکان بـۆ دامرکاندنـەوەی جووڵانەوە زیانبەخشەکان و نازیانبەخشەکانی بەدرخان بـەگ، پێـی نەگەیشـتن ئەمـەش

مانای وایە گرینگی دەدات بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی ئامادەکاریی پێویست و، ئەگەر بتوانرێت ڕێوشوێنی پێویست بگیرێتەبەر بە هۆی فەرمانی سولتانی گەورەمانەوە و، ئەوەی کە دانراوە بۆ ئەم کارە (عتوفەی عوسمان پاشا)ی فەرماندەی سوپای ئەنادۆلی هومایونییە و، هەموو کارێك پێویستی بە وەرگرتنی ڕای کەسانی تر هەیە لە ناوچەکەدا و، پێداچوونەوە بە هەموو ئەو ڕایانەدا بکرێت، فەرماندەی ناوبراو ڕێی پێ دراوە بە سەفەرکردن بۆ ئەو ناوچەیە و ئەویش لە داهاتوویەکی نێزیك دەگاتە خانەی سەعادەت، ئێستا هیچ فەرمانێك نادرێت بۆ ئەو نامە و ڕاپۆرتە ناوبراوانە، باشتر وایە بوەستێت تا فەرماندەی ناوبراو دەگات و وەڵامی ئەوانی تریش دەداتەوە، والیی ناوبراو لە جێی والیی موسڵە و ئەو ناونیشانانەی کە ڕوونی کردەوە بۆ دامەزراندن لەسەر ئەو والییە جێبەجێ دەبن، ئەوەش یەکێکە لەو پێوەندییە بەهێزانە بۆ سەرکەوتنی سولتانی گەورەمان، ئەنجوومەنەکە وای بینی کە یاداشتنامەی ناوبراو وەڵامناکەی (عیزەت پاشا) لە گەڵ بارودۆخەکە و بەرژەوەندیدا دێنەوە، لە کاتی دەربڕینی ڕەزامەندیی دەوڵەتی سوننی دەبێت ڕێوشوێنی پێویست بگیرێتەبەر لەو پێناوەدا، بەو یاداشتنامەیەدا چوومەوە و لە گەڵ نامەکانی ڕابردوودا لە گەڵ ڕاپۆرتێکیشدا بۆ پایەبەرزم بەرز کردەوە، تا بفەرمویێت بە چاوپێداخشاندنی و فەرمان لەمبارەیەوە دەربکات، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٤ی محەڕەمی ساڵی ٦٣.

بە لای سەدارەتی سامییەوە ئەو یاداشتنامە و نامانە پێویستیان بە تێڕوانینی باڵایە و، بەو شێوەیەی کە لە یاداشتنامەکەدا ڕوونم کردۆتەوە هیچ فەرمانێك نادرێت بۆ نامە و ڕاپۆرتی ناوبراو هەتا لە لایەن کەسایەتییەکانی ئەو ناوچانەوە وەڵامی نامەکە نەدرێتەوە و، فەرماندەی ناوبراو (واتە عتوفە) بگات، لە ڕاستیدا ئەو شتانەی کە والی باسی کرد جێبەجێ دەبێت لەسەری ئەوەش لە نیشانە ڕۆشنەکانی خاوەنشکۆیە، دەرکردنی فەرمان دەبێت بە ڕەزامەندیی ئەوە بێت کە لە ڕاپۆرت و نامەکەی ناوبراودا هاتووە و، هەموو نووسین و نامە هاوپێچەکانم گێڕایەوە بۆ لای پایەبەرز تا ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٩ی محەڕەمی ساڵی ٦٣

## Irade Mesail-Imuhimme 1240

ئەو بارودۆخەی ئێستا هەیە، کە شارەزا و چاودێرانی ناوچەکە چاودێری دەکەن، لەسەر ئەو کارانەی کە پێوەندیی بە کردەی سەربازیی پێشبینیکراوەوە هەیە، لە بەرامبەر بەدرخان بەگدا و، پێویستە هەموو رێوشوێنێك بگیرێتەبەر لە کاتی دەستکردن بەمکارە، میری ناوبراو ئێستا لە ناوچەکانی وان و ماردین و عیمادیە بۆ ماوەی پێنج تا شەش ساڵە نیشتەجێیە و بۆ فرەوانکردنی سنووری دەسەڵاتەکەی هەوڵ دەدات و، هەستا بە دروستکردنی پێوەندی و هاوپەیمانییەکی مەترسیداری شاراوە لە گەڵ کۆمەڵێك لە کوردە یاخییەکان و هەندێ لە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکە، کە تێڕوانینێکی زۆر خراپی بەرامبەر بە دەسەڵاتی سوننی هەیە و، فێڵ لە هەموو خەڵکی ئەو ناوچانە دەکات کە دەڵێت: ((هەموو ساڵێك پێج قروشیان لێ وەردەگرم لە گەڵ دەی دی لە کاتی هەڵگرتنەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی، هیچ شتێکی دیم ناوێت))، بەمشێوەیە خێزان و خەڵکێکی زۆری لە دەورەی خۆی کۆ کردەوە لە جزیرەی ئیبن عومەر و نیشتەجێیکردن دوای ئەوەی دەستی بەسەردا گرت، هەروەکو بە کۆمەڵێکی زۆری لە سوارەوە هات کە لە عەرەبەکانی بەغداد و شێخ شمری پێشوو بوون، لە گەڵ زیاتر لە هەزار خێزانی یاخیبووی عەرەب و، هەوڵیشی دا هۆزەکانی ماردین بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و دڵنیایان کاتەوە لەوەی کە بە ڕووی ئەو هێزانەدا دەوەستێتەوە کە گومان دەکرێت لە لایەن دەوڵەتەوە بهێنرێن.

سەرباز و پارێزەریان لە ناوچەکانی بیابان لە دووریی دە کاتژمێر لە جزیرەوە بۆ دادەنێت، تا هێز و دەسەڵاتی لەو ناوچەیە زیاد بکات و، هەروەها کاری کرد لەسەر بەهێزکردنی پێوەندییەکان لە گەڵ (عەلی بەگ)دا کە لە بنچینەدا خەڵکی (ماردین) بوو، کە دژایەتیی والییەکانی کردووە لە هەندێ کاتدا و دووو جار لە قەڵای ماردین خۆی پەنا داوە و یاخی بووە و، جارێکی دیش لە ساڵی (٨٥) هەشتا و پێنج لە قەڵای عەمادیە(عیمادیە) خۆی پەنا داوە و یاخیبوونی ڕاگەیاند، بەڵام دوای ئەوەی لە لایەن والیی موسڵ محەمەد پاشای کۆچکردووەوە ئەمانی پێ بەخشرا لە قەڵاکە هاتە دەرەوە، پاشان هات بۆ لای میری ناوبراو کە چەند ساڵێك بوو لە شاری جزیرەی ئیبن عومەر نیشتەجێ بوو و، میر دڵنیابوو لە پێوەندیی بەهێزی بەکۆچکردوو(تەیار پاشا)وە و،

شێخی هۆزی شمر کە پێشتر لە لایەن والیی بەغداوە دانرابوو، کە لەگەڵ چەند ماڵە عەرەبێکی ولایەتەکە ڕای کرد، هەرچۆنێك بێت هۆزەکانی دەوروبەری بەغدا لە لایەن والیی بەغدا و ئەوانەی دەوروبەری موسڵیش لە لایەن والیی موسڵەوە پشتگیری دەکران، بەو شێوەیە سەرکەوتوو بوو لە دانانی عەلی بەگی وەك گەورەی هۆزەکانی موسڵ و ماردین و دانانی وەك شێخێکیش لەسەر هۆزەکانی لای خۆی و، هەوڵی دا بۆ بەستنەوەی پێوەندی ماڵەکانی شمر و هۆزەکانی ماردین پێوەی.

پوختەی قسە ئەوەیە کە ترسی بەرامبەر نەیاران و ئەوانەشی لە گەڵیدا بوون بە کارهێنا، هەتا توانی زاڵ بێت بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا و هاوپەیمانییەتی لە گەڵ زۆربەی سەرانی کورد بەست، ئەوانەی کە لەسەر سەرپێچی و ئاژاوە ڕاهاتبوون، ئەو هاوپەیمانییە لە نێوانیاندا و لە نێوان میری ناوبراو هۆکاری دروستبوونی ترس و دڵەڕاوکێ بوو، لەگەڵ دەرچوونی فەرمانی ئیرادەی سوننی بە تەمێکردنی میری ناوبراو و لەنێوبردنی، هەریەکێك لەمانە ڕووی کردە لایەك، بەڵام ئەوانەی پێشتر باسمان کردن چەند جارێك هەڵگەڕانەوە و پێوەندییان بە میری ناوبراوەوە کرد، وەکو دەردەکەوێت کاتێك ڕووبەڕووی ئەو هێزانە دەبنەوە کە بۆ تەمێکردنیان دانراون، بەدرخان لە لایەن هاوپەیمانەکانییەوە هاوکاری دەکرێت و، شتێکی ڕوونە کە زیاتر لە هەزار و پێنجسەد سەرباز و سوارچاکی ئازا ئامادە بکرێت لە هۆزی شمر ئەوانەی لایەنگری دەوڵەتن کە شێخی ئێستایان ناوی (نەجریس)ە لە بەشەکانی بەغدا و، لە نێوان ئەوان و هۆزە عەرەبەکانی ئەم ناوچانەدا بەردەوام کێشە هەبوو، کە بە هۆی بەیەکەوەبەسترانەوەی دوڕگەی عەرەبی بەجزیرەی ئیبن عومەرەوە لە ڕوی جوگرافییەوە، ببووە گۆڕەپانی ئەو کێشەیە، کە دەتوانرا شێخ نجریس لە گەڵ هۆزەکەیدا لە وەرزی بەهاردا لە بەغداوە ڕوو بکاتە دووڕگەی عەرەب و، هەر لە کۆنەوە وا ڕاهاتبوو لەسەر شەڕ و دەرکردنی هەرکەسێك کە ڕووبەڕوویان دەبوونەوە لە ڕێگادا، بە بێ ئەوەی ڕوخسەت لە والیی موسڵ وەربگرێت، هەروەکو عەلی بەگی ناوبراو لەو ڕۆژانەدا لە ماردین بوو، کارەکە وا پێویستی دەکرد کە سەرۆکی ڕاسپاردە دەست بکات بە ئەو کارە سەربازییە لە سەرەتای مانگی نیسان یان لە نێوەڕاستیدا، لەبەر ئەوەی عەلی بەگ نەدەبوو لە ماردین بمێنێتەوە، چونکە گەر لەوێ بمێنێتەوە بەسەریدا زاڵ دەبن، بۆیە هێنایان بۆ موسڵ تا

وەك سالآنی پێشوو بەدەستبەسەری بمێنێتەوە لەوێ، ئەگەر شێخ نجریس لە گەڵ هۆزەکەی و ئەوانەش کە لە گەڵیدابوون لە لایەنگرانی بچێت بۆ جزیرەی ناوبراو ئەوانە دژایەتی دەکەن و، بەبێ والیی موسڵ ناتوانن ڕووبەڕووی شێخ نجریس و پیاوەکانی بوەستنەوە و داوای لێ بکەن کە بە ناچاری ڕا بکات، ئەگەر والیی بەغداد شێخ نجریس و پیاوەکانی هەڵبنێن لە سەر ڕووکردنە دوڕگەکە و بجەنگن دژ بەو دەستانە کە پاڵپشت کراون بە هەندێ لەو هێزە سەربازییانەی کە پێش مانگێك بەر لە ئێستا هێنرابوون بۆلای میری ناوبراو، کەواتە لەمەودوا جەنگ لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، ئەو دەستە سەربازییانە ناچار دەبن لە کۆتاییدا دورگەکە جێ بهێڵن و ڕا بکەن، میری ناوبراو هەموو هاوکاری و پشتگیریکردنێك لەدەست دەدات لە لایەن عەلی ماردینی و ئەو دەستە سەربازییەوە.

هەندێ هۆزی ماردین لە ڕێگەی عەلی بەگەوە پێوەندییان بە میری ناوبراوەوە کرد و، لە کاتی ناردنی هێزدا گومانی تێدا نییە دەبێت لە ڕێگەی (ماردین)ەوە بێن، چونکە ئەو ڕێگەیە کورتە ئەگەرچی پێداڕۆیشتنی زۆر سەخت و ناخۆشە، لەبەر ئەوەی ڕەشید پاشای کۆچکردوو هەرکاتێك هەڵگەڕانەوەیەك ڕووی دابا لە گوندی (فافی) سەر بە ماردین هەندێ سەربازی لەگەڵ خۆی دەهێنا بەبێ گوێدانە هۆکارەکانی دی، بەڵام وەکو ئەوە نەبوو کە پێشبینی دەکرد و، کوردەکان ڕێگایان لێ داخستن و خستیاننە نێو ناڕەحەتییەکی زۆرەوە، لە کاتی گرتنەبەری هۆکاری پێویست بۆ دەرکردنی دەستە سەربازییەکانی فارس لە دوڕگەی عەرەب بەو شێوەیەی کە ڕوونمان کردەوە، دەرکردنی بۆ بیابان ئەوا ڕێگا لە (ماردین)ەوە بۆ جزیرەی ئیبن عومەر سەلامەتە لە دەستبەسەراگرتنی عەرەب، بەڵام ئەگەر هۆزەکانی ماردین بە شێوەی تەواو ڕاپەڕن هەتا هێزەکان دەگەنە شوێنی مەبەست، ئەوان تا هێزەکە دەگات و شەڕ دەست پێدەکات کار دەکەن لەسەر گرتنی ڕێگاکە بۆ بڕینی هاوکارییەکان لێیان بە ئاشکرا و نهێنی، بەڵام گەڕانەوەی هێزەکانی فارس لە بیابانەوە دوور نییە کە پێشتر بۆی هەڵاتبوون و دەست بکەنەوە بە کاری تێکدەرانە، بۆ ئەوەی ئەو ئەگەرانە ڕوو نەدەن پێویستە ڕێوشوێنی دی لە گەیاندنی کەلوپەلی خۆراك و هاوکاری پێویست بۆیان بە ڕێگەیەکی سەلامەت بگرینەبەر، تا هۆزەکانی ماردین دەست هەڵبگرێن لە هاوکاریی ئاشکرا و نهێنی بۆ

میری ناوبراو، ئەویش بە دانانی دەستەیەك لە هێزی سوارە دەبێت بە مانگێك پێش ناردنی سەربازەکان بۆ نسیبەین کە دوانزە کاتژمێر لە شاری ماردین و هەژدە کاتژمێر لە جزیرەی ئیبن عومەرەوە دوورە، کە ئاووهەوایەکی خۆشی هەیە و ولاخی زۆری تێدایە کە پێشتر دەیانگوت ولاخ و ئەسپی دوو دەستەی سوارەی تێدایە و، سەربازگەیەکی تێدایە بە بەڵگەی ئەوەی ئەوانە ولاخ بەخێو دەکەن، ئەو دەستە سەربازییانە هەڵدەستن بە پارێزگاریکردن لە ناوچەکە هەتا کارەکە کۆتایی دێت و دڵنیا دەبین لە گەیاندن و ناردنی هەموو کەلوپەل و پێداویستییەکی گرینگ بە سەلامەتی، بەمشێوەیە هۆکارەکانی پشێوی نامێنن لە لایەك، لە لایەکی دیشەوە هاوکاریکردنی هێزە شەڕکەرەکان کەم دەبێتەوە.

ئەگەر ئەو کاتەی کە دانراوە بۆ ناردنی هێز بۆ میر بەدرخان مانگی نیسان بوو، ئەوا هاوکارییە کۆنەکان کەم دەبن و کاتی هەڵگرتنی بەروبوومی نوێش زووە، بۆ ئەوەی هێزە شەڕکەرەکان تووشی ناڕەحەتی نەبن، بە هۆی کەمیی هاوکاریی خۆراك، پێویستە خۆراکی تەواو بۆ دیاربەکر و ماردین ئامادە بکرێت و ژمارەیەکی تەواو سەرباز بهێڵرێتەوە تا پارێزگاری لەو خۆراکە بکات.

ئالۆبە و دەوروبەری جزیرەی بۆتان و حاجی بەهرام تامان کە هەندێ لە هۆزەکانی لیوای عیمادیە و قەزای زاخۆی سەربە موسڵی تێدا دەژیەن و، زۆربەی کوردە یاخیبووەکان بە فەرمانی میری ناوبراو پیلان دەگێڕن، یان هەڵدەستن بە نانەوەی کێشە و خراپە لە دەوروبەری عیمادیە بە هۆی ئەمیری ناوبراوەوە، پێویستە لەسەر والیی موسڵ ژمارەیەك هێزی سەربازیی پێویست بە هەموو کەلوپەل و پێداویستییەکانیانەوە ئامادە بکات، لە قەلای عیمادیە لە سەربازگەی داوودیە کە شەش کاتژمێر لە عیمادیەوە دوورە و، لەبەر دووریی جزیرەی ئیبن عومەر لە موسڵەوە کە نێزیکەی سی و سێ کاتژمێر دەبێت، هێنانی خواردن لە موسڵەوە کارێکی گرانە، بۆیە پێویستە ژمارەیەك هێزی تەواو دابنێین لە قەلای زاخۆ کە دوانزە کاتژمێر لە شاری ناوبراوەوە دوورە و، ناردنی بڕە خۆراکێکی زۆر بە چەند جارێك و، پاشەکەوتی بکەن بۆ ئەوەی میری ناوبراو هیچ گومانێك نەکات.

ئەو شوێنانەی بەدرخان بەرێوەیان دەبات سەر بە موسڵن، لەبەردەم ئەگەرێکدایە کـە لەوانەیە یاخییووەکانی عیمادیە یارمەتیی ناوبراو بدەن، ئەگەر والیی موسڵ ڕاسـپێرێت بۆ ئەو کردە سـەرربازییە ئـەوا نـاتوانن بـە ئاشـکرا هاوکـاریی بکـەن، لەبـەر ئـەوەی قائمقامێکی بەهێز و شارەزا دادەنێین، لە کاتێکدا کە خەڵکی موسڵ لەگەڵ خراپەکاری ڕاهاتبوون و باریان پێوە گرتبوو، میری ناوبراو نەیدەتوانی بیانجوڵێنێت بۆ خراپـە، بۆیـە پێویستە تابورێك سەرباز لە سەربازگەی موسڵ بهێڵینەوە و سەربازی زیاتر بنێـرین بـۆ سەربازگەی عیمادییە و داوودییە و قەڵاکانیان و قەڵای تەلەعفەر و کسـك کـوبری کـە سـەربازەکانیان هـەردووکیان دەکەونـە بەشـی بیابانـەوە، موسـڵ کـە یەکێکـە لـە گۆڕەپانەکانی هاتوچۆی عەرەب پێویستە ئەو سەربازانە هاوکاری بکرێن لـە کەلوپـەلی سەربازی پێویست و، والیی موسڵ ڕاسپێرین بۆ کـارکردن لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەمیر و ئاغاکان و هۆزەکـان خـەریکی هـەل قۆسـتنەوەن بـۆ ئەنجامـدانی کـاری تێکدەرانـە و خراپەکاری.

لەمساڵە پیرۆزەدا هیچ هیوایەك نییە لەسەر ئەو خـۆراك و هاوکارییانـەی موسـڵ و دەوروبەری زیاتر بێت لە هێزی خەڵکەکەی، لە کاتێکدا هـەولێر لـە سـەر بەغـداد بـوو هەژدە کاتژمێر لە موسڵ دوور بوو، لـەو شـوێنانەی کـە خۆراکیـان تێـدا زۆر بـوو، وا پێویست بوو کە خۆراکی تەواو لە هەولێر بکـڕن و بـۆ بەرپرسـەکانی بنێـرن، هـەروەها هەولێر جیگای کۆگای زۆر گەورەیە بـۆ خـۆراك، بۆیـە وا گونجـاوە کـە والیـی بەغـداد خۆراکی پێویست بکڕێت و بینێرێت بۆ موسڵ، لەوێشـەوە بـەش بـەش دەنێردرێـت بـۆ زاخۆ.

وا پێشبینی دەکرێت میری ناوبراو لە دانیشتوانی ناوچەکە و ئاوارەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا زیاتر لە بیست هەزار جەنگاوەر کۆ بکاتەوە، بەڵام ئاوارەکـان لـە گـەڵ خەڵکی گوندەکە کە بە (دەشتی) ناسرابوون ئەوانـە چـەکدار نـەبوون، بـەڵکو جووتیـار بوون، بۆیە ئەوانە ژمارەکە زیاد ناکەن جگە لە زیادکردنی ڕەشایی نەبێت، ئەگەر میری ناوبراو نەیتوانی هەواڵ بدات لەسـەر کارەکـە پـێش ڕوودانـی و خـەڵکی ئـەو گوندانـە بهێنێت بۆ ئەو شوێنەی کە خۆی تێدا پاراستووە و بەسەریدا زاڵە، ئەوا بـە دڵنیاییـەوە شوێنی لایەنی سەرکەوتوو دەکەون، بەڵام ئەگەر میری ناوبراو هۆزەکـانی لـە دەورە کـۆ

ببنەوە لە بەشەكانی (وان)ەوە پاڵشتی بكرێ جگە لەو دە هەزار خۆبەختكەرەی كە كۆی كردبوونەوە، ئەو كاتە بە پشتیوانیی (خوای گەورە) و نزای حەزرەتی مەولانا سولْتان ئەوانە ناتوانن ڕووبەڕووی سوپای نیزامی ببنەوە، ئەو كەسەی كە بە باغرێكی لەڕادەبەدەر ناسراوە، وا پێشبینی دەكرێت كە لە جزیرەی ئیبن عومەر و دەوروبەری شەڕ بكات و، نەخشەكەی وایە لە كاتی تێكشكان و پەرتەوازەبوونی هێزەكەی لە قەڵای بەهێز و پتەوی (میر سودین) خۆی پەنا بدات، كە دوو كاتژمێر لە شوێنی نیشتەجێبوونی لە (دركل) و جزیرەوە دوورە و، ئەو قەڵایە وەكو دەرگا وایە بۆ شاخی بۆتان، بۆیە ئەگەر بە یارمەتیی سولْتانی گەورەمان لەو ناوچەیە دەری بكەین، ئەوا ئومێد وایە نەتوانێت لە هیچ شوێنێكی دی وا خۆی ڕابگرێت، ئەگەر نەكەوێتە دەست هێزەكانمان بە دڵنیاییەوە دەچێتە شوێنێك كە پێشتر داینا وە.

ئەگەر میر بەدرخان پێش ڕوودانی بەهەڵمەتەكەی زانی، ئەوا هۆزەكانی وان و دیاربەكر و ماردین و موسڵ دەوروژێنێت تا كێشەیەكی گەورە دروست بكات، بۆیە پێویستە جووڵە سەربازییەكە زۆر بە نهێنی ئەنجام بدرێت و، پێویستە هەواڵی ناردنی سەربازی سولْتانی بۆ بەغدا و موسڵ بڵاو بكەینەوە نەك بەرەو جزیرە، هەروەكو پێویستە خۆراك لە گوندەكانی جزیرەوە كۆ بكەینەوە تا سەربازەكان تووشی نارەحەتی نەبن و، كار بكەین لەپێناو گەیاندنی بۆ شوێنە پێویستەكان و، فەرماندەی سوپای هومایونی هەستێت بە ناردنی نامەیەك لە گەڵ كەسێكی گونجاو بۆ لای میری ناوبراو و، هەركاتێك هێزی نیزامیم نارد، ئێوەش بینێرن بۆ (نسیبەین) بە بیانووی بەخێوكردنی ئاژەڵ، تا بۆ جەنگ ئامادە بن و، گفتوگۆ و مامەڵەیەكی زۆر نەرموو نیان لەگەڵ میری ناوبراودا بكەن، بەتایبەتی بەرژەوەندی وا دەخوازێت كە فەرماندەی سوپای هومایونی و والیی موسڵ بە نەرمونیانییەكی زۆرتر و باشتر هەڵسوكەوتی لەگەڵ بكەن تا كاتی دەستپێكردنی هەڵمەتە سەربازییەكە دێ.[٢٣]

---

(٢٣) ئەمە سیاسەتێكی دیاری داگیركەرانی كوردستان بووە، كە لە كاتی بەهێزیی شۆرشەكانی كورد و لاوازیی خۆیاندا پەنایان بۆ بردووە، بەتایبەت دەوڵەتی عوسمانی تا سوود لە كات وەربگرن و، میر و سەركردەكان هەڵخەڵتێنن، بێگومان زۆربەی كاتیش كورد بەوجۆرە مامەڵانە هەڵخەڵەتاوە و باجەكەی داوە. و.

کارێکی پێویستە کە ئەو ڕێوشوێنانە بگریتەبەر دەربارەی ئەو کـردە سـەربازییانەی کە بەدرخان بەگ پیێ هەستا لەو ناوچانەدا کە مەقامی باڵا پێی قایل نییە لە نێزیکترین کاتدا، لەبەر ئەوەی دەوڵەت پاشای فەرماندەی هومایونیی ئەنادۆڵ کەسێکی دووربـین و لێهاتووە، وا گونجاوە ئەو کارە گرینگە بەو بسـپێردرێت، وێنەیـەك لـەو ڕاپۆرتـەی کـە فەریق ئیسماعیل پاشای سەرۆکی ئەرکانی سوپای ناوبراو ئامادەی کردبـوو نـاردی بـۆ ویلایەتی موسڵ و دیاربەکر و ئەرزڕۆم کە لە ڕاپۆرتەکـەدا هـاتبوو، کـاتی گونجـاو بـۆ ئەنجامدانی ئەو هەڵمەتە سەربازییە سەرەتای مـانگی نیسـانە و، پـێش دەسـتپێکردنی هەڵمەتەکە پێویستە باش لە بابەتەکە بکۆڵرێتەوە، بەو شـێوەیەی کـە پێویسـتە و، لـە نێوان من و ویلایەتە ناوبراوەکاندا پێوەندیی نووسین هەبوو لەبارەی ئەو هۆکارانـەی کـە پێویستن بۆ لابردنی میری نـاوبراو و هەڵوەشـاندنەوەی کـاتی دەسـتپێکردنی هەڵمەتـە سەربازییەکە و، ئایا سوپای هومایونی هێزی تەواوی هەیە تا بتوانێت ئەو ناوچـانە لـە خراپەکاری پاك بکاتەوە؟ ئایا ئەوێ پێویستی بە سەربازی زیاتر هەیە؟ ئایـا ئاسـانترین ڕێگە چییە بۆ سەرکەوتنی کردە سەربازییەکە؟ داوام کرد وەڵامی هەموو ئەو پرسـیارانە بۆ فەرماندەی سوپای ناوبراو بنێرم، دوای ئەوەی دەسەڵاتی سوننی ڕەزامەنـدیی لەسـەر دەربڕی و، بەپێی ئەو دەسەڵاتە وێنەیەکی نێردرا بۆ لای والییەکان و، وێنەیەکی لە گەڵ هاوپێچەکانیدا بۆ منیش نێردرا، دوای ئەوەی سەیری ئەو نامە نێردراوانە کرا بە تەواوی بابەتەکە زۆر بە گرینگ وەرگیرا و لابردن و نەهێشتنی کێشەکەش بە شتێکی پێویسـت دانرا.

تەماشای ئـەو فەرمانـە گرینگـەم کـرد کـە بـە نهێنـی لەگـەڵ وێنـە ناوبراوەکـان ڕاگەیانرابوو، کە بارودۆخی میری ناوبراوی تێدا ڕوون کرابووەوە، لە گەڵ ئەوەدا پرسیاری دەکرد لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی لابردنی و نەهێشتنی کێشەکان لـەو ناوچـانەدا و، ژمارەی ئەو سەربازانە چەندە کە پێویستە بنێردرێت؟ ئەو وەرز و کاتە گونجاوە چییە بـۆ ئەم کارە؟ گەیاندنی بە مەقامی باڵا و فەرماندەی ناوبراویش، بەوەی کە بەپێی شەرع و یاسا، میری ناوبراو زۆر دەمێکە شـایەنی تەمێکردنـە و، پێویسـتە لاببرێـت و خەڵکـە هـەژار و ژێردەسـتەکانی لـە خراپـە و شـەڕی ئـەو ڕزگـار بکـرێن، ئـیرادەی سـوننی لەمبارەیەوە دەرچووە، ئەمەش خواستی حەزرەتی مەلانا سوڵتانە و پێویستە بێتـەدی و

جێبەجێ بکرێت، لە دوای ئاگاداریمان لەسەر هەموو ئەو کارانەی کە زۆر گرینگن، نووسینی سەرنج لەمبارەیەوە کارێکی پێویستە لەسەرم لەگەڵ ئەوەدا خۆم ئەو ناوچانەم نەبینیوە، بەڵام وەك کارمەندێك چەند جار لە ئەرزڕۆم سیواس کارم کردووە بە هۆی نێزیکی و هاوسێیەتی لە گەڵ ئەو ناوچانەدا و، هەندێ زانیاریم لایە لەبارەی میری ناوبراوەوە، بەڵام ئەو زانیارییانە بەس نین بۆ ئەوەی کە بە کردار ئەنجام بدرێت و، زۆر لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی فرەوانم کردووە تا بگەمە زانیاریی زیاتر لەمبارەیەوە بە هاوکاری لە گەڵ پیاوانی ڕاستگۆ و خاوەن متمانە کە زۆر چاك ئەوانە بارودۆخی ئەم ناوچانە دەزانن و ڕاستەوخۆ ئاگادارییان هەیە بەسەر بارودۆخی میری ناوبراودا و، ئەوەی لەمبارەیەوە وەرم گرت و کۆم کردەوە لەسەر وەرەقەیەك نووسیم و پێشکەشی مەقامی باڵام کرد و، میری ناوبراو زانیارییەکی زۆری لەسەر ئەو ناوچانە هەیە، کە لە لایەن هەموو ئەوانەوە کە لە دەوری بوون هاوکاری دەکرا، ئەگەر لێپێچینەوە لەسەر ئەو بابەتە شتێکی سادە بێت، ئەوا کارەکە هەر گران دەبێت و، ئەو کارانە دەبێت زۆر بە ڕژدی وەربگیرێن و هۆکاری سەرکەوتووی زیاد لە پێویستیان تیادا بگیرێتەبەر و، چەند ڕۆژێکم لە تۆمارکردنی بیروبۆچوونەکانم بەسەر برد، کە بەش بەش بەمشێوەیەی خوارەوە دەیانخەمەڕوو:

لە ماوەی کارکردنی دوایم لە ئەرزڕۆم پێش هەشت مانگ، داوایەکم بۆ هات بە ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك لەسەر بارودۆخی (وان)، سەبارەت بەوەی کە چی پێویستە بکرێت تا بیانگێڕینەوە ژێر گوێڕایەڵیی خۆمان؟ بەو شێوەی ئێستا ڕوونم کردەوە، لە گەڵ ئەوەدا من ئاگاداریی تەواوم لەسەر هێزی ئێستای بەدرخان بەگ نەبوو.

مەسەلەی ئێران لەو ماوەیەدا گەیشتە کۆتایی، وەك لە ڕاپۆرتەکەدا ئەوەشم ڕوون کردەوە، سەبارەت بە یاخیبوانیش یەکەمجار هەوڵدان بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵییان بۆ دەوڵەت ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوا بەو شێوەیە چارە دەکرێت و، ئەگەر گوێڕایەڵی دەرنەبڕن، ئەوا بڕیار دەدرێت بە بەکارهێنانی هێز و قەزاکانی سەر بە بەدرخان دەخرێنە ژێر دەسەڵاتی یەکێك لەو فەرمانڕەوایانەی کە جێگای متمانەی فەرمانەدەی سوپای هومایونین لەوەی کە دەتوانن ڕێگایان لە بەردەم دابخەن و نەهێڵن زیان بە (وان) بگەیەنێت، بەڵام بەو شێوەیەی کە ڕوونی دەکەمەوە لەو ڕاپۆرتەی کە بۆ بەڕێزتانی

دەنێرم، دروست نییە ئەو کارانە بە ئاسانی وەربگرن لە بەرامبەر هێزی میری ناوبراودا، بەو شێوەیەی کە فەرماندەی سوپای هومایونی پێی گەیشت، ئەو کارانە و ئەوەش پێویستە بکرێت بە وردی دەیزانێت ئەوەیە پێویستە ئەندازەی ئەو هێزەی کە دەنێردرێت نابێت لە بیست هەزار سەرباز کەمتر بێت بە هەموو پێداویستییەکەوە، لە گەڵ ئەوەدا زۆرترین سەربازە نیزامییەکانی سەر بە سوپای هومایونی بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە ناوچەکانی ئەرزڕۆم و مەلاتییە و ماردین و دیاربەکر و سیواس جێگیر کرابوون، بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکان بەکار دەهێنرێن، بۆم ڕوون بووەوە ئەوەی لە بنکەی سوپای هومایونی هەیە بەراورد دەکرێت بە دوو بەش لە سوارە و چەند تابورێك لە سوپای پێرۆ و، کێشانەوەی هێزەکان لەم ناوچانەدا لە کاتی شەڕدا دروست نییە لەبەر ئاسایشی ناوچەکە و، وا بەباش دادەنرێت کە ژمارەی تەواو لە سوپای خانەی سەعادە و دوڕگەی عەرەبی بگەیەنرێت بە سوپای ئەنادۆڵی هومایونی بەر لەڕاگەیاندنی هەڵمەتەکە و، ئەگەر ناردنی هێز لە سوپاکانی دی بە ڕەزامەندی نەبێت، ئەوا وێدەچێت کە سیانزە یان چواردە هەزار لە فەرمانبەرانی سوپای ناوبراو لە پێرۆ و سوارچاکان و تۆپ و جبەخانە بنێردرێن و، ئەوانی دیش لە سوپای نانیزامی بنێردرێن تا کارە سەربازییەکە ئاسان بێت لەو ناوچە ناخۆش و سەختانەدا و، دەبێ سوپا نانیزامییەکە لەژێر دەسەڵاتی وەزیرێکی زۆر شارەزا و لێهاتوودا بن، وا چاوەڕوان دەکرێت کە ئێستا ویلایەتی موسڵ بێ والییە بە شێوەیەك لەگەڵ ویلایەتی دیاربەکر یەك بخرێن و، وەزیرێك بەو سیفەتانەی کەباس کران بۆیان دابنرێت و، ئەو وەزیرە دەبێت زانیاریی نهێنی پێ بدرێت لە هاوکاری تەواو و ڕاوێژکردن لە گەڵ فەرماندەی سوپای ناوبراودا و، نێزیکەی چوار هەزار سەرباز لە سوپای نانیزامی کۆ بکرێتەوە لە ناوچەکانی ویلایەتی ئەرنائوت (ئەلبانیا) و (ئەدرنە) لەگەڵ سەرۆکەکانیان و ناردنیان بۆ بەشی وەزیری ناوبراو لە ڕێگەی دەریای سامسون (دەریای ڕەش)وە و، ڕێگە بدرێت بە وەزیری ناوبراو کە نێزیکەی دوو هەزار سوارچاکی نانیزامی کۆ بکاتەوە و، ژمارەی تەواو لە چەك و جبەخانە و کەلوپەل و خۆراك و شتی دی ئامادە بکرێت، بەو شێوەیە بە یارمەتی (خوای گەورە) و حەزرەتی مەلانا سوڵتان سەرکەوتن و هێنانەدیی ئامانجەکانمان کارێکی ئاسان دەبێت، هەروەها

دەبێتە کارئاسانی بۆ لێك بڵاوکردنەوەی ئەو خەڵکانەی کە بەدرخان لە دەوری خۆی کۆی کردوونەوە، دوای ئەوەی ئەمانیان پێ دەدرێت.

لە وەڵامنامەیەکدا لە ئەنجامی ڕوونکردنەوە و بەدواداچوونی بەشە ناوبراوەکان لـە ڕاپۆرتەکەمدا لە بەشی (وان)دا هاتووە، هەتا کێشەی ئێران کۆتایی نەیەت نابێت دەست بەو کارە بکرێت، لە گەڵ ئەوەدا بارودۆخی ئێستای کێشەی ئێران نازانم و، هەتا بڕیار لە مەسەلەی ناوبراو نەدرێت، ئەوا ئەوەی باسم کرد هیچ کاریگەر نابێـت، لەگـەڵ ئـەوەدا وای دابنێین کە خیانەتکارە ناسـراوەکان لەسـەر ناپـاکی و خیانـەتی خۆیـان نـەماون و پێداگری ناکەن و، ئەوەی کە لە توانیاندایە بەکاریان خستووە بۆ هاوکـاری و پشـتیوانی مـیری نـاوبراو، ئـەو هاوکارییـە هـیچ کاریگـەری نـەبوو لەسـەر جێبـەجێکردنی ئـەو ڕێوشوێنەی کـە باسمـان کـرد، لەگـەڵ ئـەوەدا لـە کـاتی دواخسـتنی مەسـەلەکە یـان هێشتنەوەی تا کاتی ناردنی سەرباز بۆ (وان)، لە گەڵ ئەو ڕێوشوێنەی کە گرتوومەتەبەر دوای جیابوونەوەم لەوێ، ئەوا هاوپەیمانی و تێکگەیشتنێك هەیە لە نێوان والی ئـەرزڕۆم و ئەنوەر ئەفەندی کە سەرپشك کرابوو بۆ ئـەم کـارە و، لـە ڕێگـەی قائمقـامی مـوش شەریف بەگـەوە دڵنیـایی و سـەلامەتی دەدرێـت بـە سـەرۆکە هەڵگـەڕاوەکانی (وان و هەکاری) و، ئومێد دەکرێت کە ئەوانە ڕێگری بکەن لە هاوکـاریی ئاشـکرای بـەدرخان، هەتا ئەو کاتە مەسەلەی ناوبراو بە تەواوی کۆتایی دێت و ڕێککەوتننامەیەك لە نێـوان هـەردوو دەوڵەتـدا مـۆر دەکرێـت، لـەو کاتـەدا ڕێکخسـتنی سـەربازەکان و دانـانی سەرکردەیەك بۆیان یەکێکە لە کارە پێویستەکان.

بە ڕا و بیر و بۆچوونی خۆم پێویستە فەرماندەی نـاوبراو لەگـەڵ والیـی دیاربـەکر و ئەرزڕۆم و موسڵیش ئاگادار بکەینـەوە ئەگـەر پێویسـت بـوو و، مـن ئـەو ئاگادارییـەم دواخست بۆ دوای خستنەڕووی بیر و بۆچوونەکانم بۆ مەقامی چاودێری باڵا و، لە کـاتی ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەمدا وەڵامی دایەوە، نامەیەکی نارد و تیایدا ڕوونی کـردەوە کـە پێویستە ڕاپۆرتەکە بە زوویی بگاتە دەستی بە مەبەستی ئەوەی فەرماندەی ناوبراو خۆی سەرپشکە لە هەستان بە ئەنجامدانی ئەو هەڵمەتە سەربازییە، بۆیە پێویسـت بـوو ئـەو ڕاپۆرتە زوو بنێردرێت بێ ئەوەی دوا بکەوێت، دوایی ڕاپۆرتەکە و وێنەیـەکی نامەکـەم نارد بۆی لەگەڵ دواخستنی ناردنی ڕاپۆرتەکەم بۆ هەریەکە لە والیی ئەرزڕۆم و دیاربەکر

بۆ دوای وەڵامدانەوەی نامە و ڕاپۆرتەکە لە لایەن چاودێری باڵاوە و، بەو پێیەی کە لە وەرەقە هاوپێچەکەدا ڕوون کراوەتەوە هەڵمەتە سەربازییەکە لە مانگی نیساندا تەواو دەبێت، واتە لە ماوەی چوار مانگدا، بۆیە پێویستە لە ئێستاوە کار بکرێت بۆ ئامادەکردنی سەرباز و کەلوپەلی پێویست، بو دڵنیایی ڕای ناوبراو دەگات بە مەقامی چاودێری باڵا، دوای بینینی ئەو بیروڕایانە لە لایەن مەقامی باڵاوە ئێمە چاوەڕێی فەرمانین، بەوەی کەوا بەکارهێنانی ویست و توانا لە جێبەجێکردنی ئەم کارە پێویستییەکی سەرشانمانە، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمری چاکەکارە.

لە نووسراوی مەقامی چاودێری باڵادا هاتووە کە لە سەرەتای مانگی جەمادیی دووەمی ساڵی ٦٣دا پێی هەستا لە بارەی گرینگیی مەسەلەی (وان) و خستنەبەردەمی بەدرخان بەگ و، پێشتر ڕایگەیاند کە سەرەتا و کۆتایی تێ بگەیەنن دەربارەی گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست لەبارەیەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەدرخان بەگ بیروباوەڕێکی خراپی هەبوو لەو ناوچانەدا، بۆیە کاری گرینگ ئەوەیە کە سەرەتا ئەو گرفتە کۆتایی پێ بهێنین و، دوای کۆتاییهێنانی ئەو کێشەیە ئەوە سەر دەکێشێت بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ چارەسەرکردنی کێشە سەرەکییەکەی و، لەسەر فەرمانی گەورەمان کۆتاییهێنانی بەو کێشەیە بەهێزی سەربازی زۆر کاری باشی لێ دەکەوێتەوە و، دەستکردن بە کارێکی دی پێش ئەوەی گرفتی یەکەم کۆتایی بێت دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕێوشوێنە پێویستەکان، چونکە کێشەی ناوبراو وەکو لە بەندی سێیەمی عەریزەکەمدا هاتووە، ئەویش بەشێکە لەو کێشەیە، هەتا زووتر ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێت، ئەوا دەبێتە هۆی ئاسانکردنی چارەسەری کێشە سەرەکییەکە و، زۆری سەربازی نیزامی لە بەشی (موش) و خۆڕاگری لەوەدا لە کاتی ئێستادا دەبێتە هۆی هەڵنانی سەرپێچیکاران لە هەستان بە چەندین کاری خراپەی جۆراوجۆر و، ئەو وەرەقەیەی کە خان مەحمود بۆ براکەی و برازاکەی نارد، هەرچونێك بوو ناوەرۆکەکەیمان پێشکەش بە مەقامی باڵا کرد، باشترین بەڵگە لەسەر ئەوە کە دەیڵێین، بەشێوەیەك وەرزی زستان لەو شوێنانە لە کۆتایی مانگی ئۆگۆستدا دەست پێدەکات و، چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێویستی بە گەمارۆ و دانانی تۆپ و هاوەن نییە، بەڵکو بریتییە لە ناردنی ئەو سوپا نیزامییەی کە لەوێن و، تێبگەیەنرێن ئەگەر نەیەنە ژێر گوێڕایەڵیی دەسەڵات ئەوا

هەموو جۆرەکانی جەنگیان لە گەڵ بەکار دەهێنین، بۆیە پێویستە ئەو گرفتە کۆتایی بێت و، ڕای گشتی ئەوەیە کە دوا نەخرێت بۆ ساڵی داهاتوو، چونکە بە دواخستنی بارگرژییەکە کۆتایی نایەت و، ئەگەر مەقامی باڵا فەرمانی پێویست دەرنەکات ئەوا پێویستە چاودێریی بارودۆخی ئەو ناوچانە بکرێت، ئەوەش پێویستی بە بارقورسییەکی زیاتر هەیە و، چاوپۆشیکردنی لە ناردنی سوپای نیزامی وا دەبینین کێشەکە چارەسەر دەکات و، ئەگەر بڕیار بدرێت جارێکی دی دوا بخرێت و وەرزەکەی بەسەر بچێت لە گەڵ کۆکردنەوەی هێزەکان لە (وان) و، چارەسەری ئەو گرفتە بۆ ساڵی دواتر دوا بخرێت، ئەوا بارودۆخی (وان) زیاتر بەرەو خراپی دەچێت، بە شێوەیەك هەندێ لە خەڵکی هەژار ناچار دەبن ڕا بکەن و ئەو ناوچەیە جێ بهێڵن، بە هۆی زوڵم و زۆری خراپەکاران و، ئەوەی کە دەمێننەوەش لەمەودوا هەڵدێن لە ترسی زیاتر خراپبوونی بارودۆخەکە، ئەوەی باسمان کرد لە ڕاپۆرتەکەماندا لێکدانەوەی ڕاستییەکان بوو و، هەستان بەوەی کە پێویستە بکرێت پەیوەستە بە ئیرادەی عیللی عوسمانییەوە، فەرمان لە هەموو بارودۆخەکاندا بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

**٢١ی جەمادیی دووەمی ٦٣**
**دفترداری ویلایەتی ئەرزڕۆم**
**والیی ویلایەتی ئەرزڕۆم**

### ڕوونکردنەوەیەکی ڕاستگۆیانە بۆ مەقامی باڵا:

ئێمە هیچ دەستێکمان لەو پێشێوی و ئاڵۆزییەی کە لە (وان) و دەوروبەریدا نییە کە بۆ ماوەی سێ ساڵ تا ئەم دەقیقەیە ڕووی دا و، هیچ بارێکمان بە زوڵم و زۆری و بەرتیل لە خوشاب و واندا وەرنەگرتووە، من هەموو کاتێك گیان و ماڵم لەپێناوی خزمەتکردنی دەوڵەتدا دەبەخشم، ئەمجارەیان فەرمانێکی گرینگم بۆ هات لە ڕێگەی شەریف ئاغاوە کە یەکێك بوو لە کەسایەتییەکانی (وان) کە پلەی گەورەی دەرگەوانەکانی پێ بەخشرابوو، دوای ئەوەی فەرمانەکەم کردەوە و خوێندمەوە من لە قەڵای (سدمانسق)

بووم که چوار سەعات لە ئێران دوور بــوو، دوای دەربڕینــی گوێڕایــەڵی بــۆی، پوختــەی وەڵامی نامەکە ئەوە بوو کە من بەپێی وەڵامی ئەوانی دی بۆ فەرمانەکە کار دەکەم و، پاشان دوای سێ ساڵ قائمقامی قەزای( موش) (شەریف بــەگ) هــات بــۆ مــاڵی (خــان مەحمود بەگ) بۆ داوای ڕادەستکردنی هەردوو قەڵای (وان و خۆشاب) بۆ بەدرخان بــەگ و، ڕوونی کردەوە کە لە نێوان ئەو و بەدرخان بەگدا خزمایەتی هەیە و لەسەر ڕاوێــژ لــە نێوانیاندا دەسەڵات ئاڵوگۆڕ دەکەن، ئەوەش لای بەڕێزتان دیارە، دوای ئەوەی زانیم کــە ڕاوێژ دەکەن بە ناوبراو فەرمانم کرد بە کارمەندێك بە پاراستنی قەڵای لیوزباشی سلێمان ئاغا کە یەکێك بوو لە سەربازە تۆپهاوێژەکان بەوەی کە لــە توانــای تــۆدا نییــە قــەڵای ناوبراو وەربگرییەوە و پارێزگاری لێ بکەی و، ئێمە بە هۆی خۆشەویســتی و دڵســۆزیمان بۆی پێچەوانەی فەرمانی فەرماندەی بەڕێز ناکەین و، سوێندمان خواردووە کــە قەڵاکــە بگرین و نەهێڵین بکەوێتە دەست بەدرخان بەگ و، دوای شەوێك لە ڕادەستکردنی میرزۆ کە یەکێك بوو لە پیاوەکانی بەدرخان بەگ هات و قەڵاکەی وەرگرت و، گــوتی دودبــری عەلی ئاغای لەسەر دادەنێت، میرزۆ گوتی، ئێمە بەردەوامین لە سەر چوونە نێــو قــەڵای (وان) و، ناوبراو گەڕایەوە بەشی (وان)، دوای ســەفەرکردنی (عــەلی ئاغــا) بــۆ بەشــی جزیرە، براکەمان (خان مەحمود بــەگ) هــات و هــەمان وەڵامــی دایــەوە، لــە ئێســتادا هەواڵەکان دەڵێن سەربازیان بەرە و ئێمە هێناوە لە بەشی بۆتان ئێمــەش کۆمــەڵێك لــە خێڵەکانمان نارد بۆ بەشی (سدمانسق) و، هەندێ لە خێزانەکانیش بــەرەو کــواش ڕایــان کرد، ئەگەر فەرمانی دەوڵەتی سوننی دەرچێت لەسەر ئەوەی کە ئێمە دۆست و دڵسۆزی دەوڵەتین و، دەستەیەك بە جلوبەرگی نیزامی و پلــەی مــیر ئــاڵای لــە لایــەن حــەزرەتی مەولانا سوڵتانەوە بنێردرێن و، جلوبەرگ و نیشانەم نارد لە گەڵ سێ کەسدا بە هاوەڵیی یەکێك لە پیاوەکانمان و، جووڵەشمان بەو شێوەیە دەبوو، بەو شێوەیە هەموو پیاوەکانیــان بە ڕێزەوە وەرگرتین، بەڵام ئەگەر خزمەتمان نەکەن و ڕێوڕەسمی ئەفەنــدی بــەڕێوە نەچــێت ئەو کاتە ئێمە شوێن بەدرخان و خان مەحمود ناکەوین، بەڵکو پەیمان دەبەستین لــە گــەڵ شای ئێران، بۆیە تکایە وامان لێ مەکەن جگە لە ئێوە پێویستمان بە کەسی دی بێت و، زۆرترین ئەوەی کە من پێویستم پێیەتی ئەوەیە کە نــاوم تۆمــار بکــەم لــە گــەڵ پیــاوە

دڵسۆزەکان، هەستام بە نووسینی ئەم نامەیە بە شێوەیەکی بوێرانە، بۆیە تکایە هیوا و ئاواتەکانم لەنێو مەبەن، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

٢٩ی جەمادیی یەکەمی ساڵی ٦٣ (١٨٤٦ز)

عەبدوڵا خان

لە گەڵ ئەوەدا کە خۆم بە بەندەی عیللیی عوسمانی دەزانم، ئەمجارە ڕێنمایی ئێوەم بۆ هات دوای کردنەوە و خوێندنەوەی لە گەڵ چاودێریکردنی ڕێوڕەسمی بەڕێوەچوونی دەربڕینی گوێڕایەڵی و ملکەچی و، من هەموو کاتێك چاوەڕوان بووم کە ڕێز لە دڵسۆزییەکەم بگیرێت لە لایەن فەرماندەی گەورەوە و، ئەگەر ببیستم کە فازڵ بەگی تەیمورزادە کە یەکێك بوو لە کەسایەتییەکانی (وان) پەیمان دەدات بە ڕادەستکردنی هەردوو قەڵای (وان و خوشاب) بە بەدرخان و کاروبارەکان دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، سوێندمان خوارد بۆ سلێمان ئاغا کە پارێزگاری قەڵای ناوبراو بکەین و لەگەڵ ناوبراودا تێیدا ماینەوە و، لە ڕۆژی دواتردا (میرزۆ) هات لە لای بەردخانەوە، ئەویش داوای لێ کردم، بەڵام وەڵامی نەدایەوە سەفەری کرد بۆ (وان) و قەڵای وانی تەسلیم کرد (ئەوەش قسەیەکی بێ مانایە)...

پیاوەکان نامەیەکیان بۆ تەیمورزادە نارد و پێیان گوت ئەگەر قەڵاکە تەسلیم بە هەرکەسێکی دی بکەی، ئەوا بزانە گوند و زەوی و زارەکانی سەربەوێ لە لایەن هێزی فەرماندەوە تالان دەکرێن، بۆیە پێویستە لەسەرت پارێزگاری باشی لێ بکەی، لە کاتێکدا خان مەحمود نامەیەکی بۆ ناردم و تیایدا داوای کردبوو بە ڕادەستکردنی قەڵای (مەحمودی) و قەزاکەی بۆ کوڕەکەی و پیاوەکان لای خۆی دەستبەسەر بن، بەڵام ئەو پیاوانە پێویستیان بە هیچ شتێك نەبوو، بۆیە بە گەورەیی حەزرەتی مەولانا سوڵتان بەسەر خان مەحمود بەگدا سەردەکەوین و، بەرپەرچدانەوەمان بەو شێوەیەی کە لە نامەکەی ناوبراودا لە ڕۆژی پێنجشەممەی ٥ی مانگی جەمادیی کۆتاییدا ڕووی کردە بۆتان و، هەندێ لە خێڵەکانی ئێمەیان لە گەڵ خۆیان برد، بۆیە تکایە بەکباشی لە گەڵ هەندێ کەس لە گەڵ ناسر ئاغا بنێرنە لامان و، بفەرموون بە ناردنی ئەمیر ئالا و دەستەیەك لە جلوبەرگ ئەویش بە ناردنی تابورێك یان دوو تابور لە سوپا دەبێت تا لە

(وان) بمێننەوە، بەڵام ئەگەر ئەمە دوا بکەوێت ئەوا قەڵاکە تەسلیم دەکەین و ڕادەکـەین بۆ ئێران ئەو کاتە (وان) بە تەواوی لەژێر دەستتان دەردێت، تکایـە ئـەم بارگرژییـە دوا مەخەن کە پێش چەند ڕۆژێك ئاگادارمان کردنەوە، ئەوەشمان نارد بـۆ لای بـەڕێزتان بـۆ ڕوونکردنەوەی بارودۆخەکە، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

جەمادیی دووەمیساڵی ٦٣/ عەبدوڵا خان

## Irade Mesail-Imuhimm 1266

**مایسی ٢٤، ١٨٤٧**

**گەورەم عتوفە:**

ئەنجوومەنی بریکارەکان تایبەت لە ڕۆژی پێنجشەممە کۆ بووەوە، بۆ قسەکردن لەسەر ئەو دوو نامەیەی لەپاشای والیی ئەرزڕۆمەوە لەسەر بارودۆخی وان و نامەی پاشای والیی دیاربەکر لەسەر بەدرخان بەگ گەیشتبوون، لە نامەکەی والیی ئەرزڕۆمدا بەو شێوەیە هاتووە، کە پێشتر هەواڵی داوە بە گەیشتنی فەرمانی بالاّ هەتا خەڵکی لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ شەریف ئاغا هەڵبدەنەوە، ئەو لە پیاوماقوڵانی وان بووە، کە گەیشتۆتە وان بە دروستی لەگەڵ خان مەحمود دوواوە، بەڵام دوایی دەرکەوتووە کە مەحمودخان سوێند و پەیمانی لەگەڵ بەدرخان هەیە کە لە فەرمانی دەرنەچێت، ڕوخسەتی وەرگرتووە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەمە بێجگە لە تەیمور زادە، خەڵکی سوپاسگوزارییان ڕاگەیاندووە بۆی کە لێبوردنی بالاّی بۆ دەرچووە، پێیان وتووە بە دوای ناوبراو نەکەوێ، مەحمودخان بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ شەریف ئاغا دابنێ، ژمارەیەك کورد و سوارە و پیادەی ناردۆتە سەر ماڵەکەی و ناچاری کردووە هەڵێ بۆ ئەرزڕۆم، دوێنی برایەکەی مەحمودخان لەگەڵ ژمارەیەك یاخی ناردووە بۆ ناحیەی ئەخلات ڕەشید بەگ کە لە نێزیکەکانی شەریف ئاغا بووە دەریان پەڕاندووە، هەروەها هەڕەشەی بەهێرشکردنە سەر بەدلیس کردووە، بۆ ئەوەی سنوورێکیان بۆ دابنێ، موحەمەد بەگی قائمقام بە سەربازی نیزامییەوە لە قەزای ناوبراو، بە شەش تیپی سەربازی نیزامی سوڵتانی و تۆپێکەوە بەرەو گوندی ناوبراو ڕۆیشتوون، هەزار کەس لەو کوردانە کە توانای بەرگرییان نەبووە هەڵاتوون، بۆ ئەوەی سەربازە نیزامییەکانی سوڵتان کە لەلای موش کۆ بوونەتەوە، بۆ ئەو مەبەستە دەرچن، دووجار سێ تیپیان ناردووە، ئاگادار کراونەتەوە خۆدوور بگرن لە هێرشبردن بۆ سەر خان مەحمود و دەورووبەری وان، سەرتیپ ئەحمەد پاشای فەرمانەدەی سەربازەکانی سوڵتان وای دەبینێ ئەوەی خان مەحمود ئەنجامی داوە لە کاری خەراپەکاری و ئاژاوەگێڕی لەپاڵ ئەو هەموو هێزە سەربازییە، خان مەحمود ناتوانێ لە بەرانبەر سوپادا بەرگری بکات، هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا

نییە، بێجگە لە هەڵاتن و پەنابردنە بەر قەڵایەکەی، بۆ ئەوەی گرووپەکەی پەرت و بڵاو بکرێت و ئارامی و ئۆقرەیی دابین بێت، دەبێ تیپی ناوبراو بەرەو موش ببزوێ، لەگەڵ ئەوەدا لەسەر ئەو مەسەلەیە نووسراو چووە بۆ دەوڵەتی پاشا موشیری سوپای هومایونی هەتا دەرفەت بدات لەو ڕووەوە کارێك بکرێت، بەڵام وڵامەکەی وەکو ڕاسپاردە داوەتەوە، ئەو هەڵسوکەوتەی شەریف ئاغای ناوبراو لە خراپی باری ئۆقرەیی هێناویەتی گرینگە و دەبێت نیزام لەوێ فەرز بکرێ، بەڵام بڕیار دراوە ئەو کارە دوا خراوە بۆ دوای بەدەستهێنانی ئەوەی بۆ مەسەلەی بەدرخان پێویستە، ئەوەی لە گفتوگۆکانی پێشوو و ئیرادەی سوننی پەیوەست بەو کارە هەیە، لەناردنی سەربازی نیزامی سوڵتانی پێویست بۆ گوندی ناوبراو بۆ پاراستنی وڵات، ئەگەر هەندێ لەیاخیبووان لەڕێگەی ڕاست لایان داوە ئەوە وەکو لە بەرچاوی پیاوماقوڵان بەدیار دەکەوێ بەتوانای (خوای گەورە) و حەزرەتی مەولامان سوڵتان ئاشکرایە چارەنووسیان خەسارەتمەندییە، بەڵام سەبارەت بە بابەتی ئەرکی ئەو تیپەی ئاماژەمان پێدا کە لە لای موش دانراوە بۆ چاوترساندن و پەشیمانکردنەوەی خان مەحمود، فەرماندەی ڕێنوماییکەری سوپای هومایونی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر چالاکییە سەربازییەکانەوە هەیە، هەر دەستێوەردانێك لەو باریەوە ئەرکەکە پەرت و بڵاو دەکاتەوە، چونکە ئەو چالاکییە سەربازییانە لە لای وان تیپی ناوبراو پێی هەڵدەستێ، بەپێی زانیاریی سەربازی و توانستی ڕێنومایکەریی ناوبراوەوە، ئەنجوومەن بە گونجاوی دەبینێ بە بیرۆکە و بۆچوونەکانی والی ئاگادار بکرێتەوە کە ئاماژەمان پێدا، هەروەها وێنەیەکی لە نامەی هاتوو بۆ دەربهێنێ هەتاوەکو ئەوەی پێویستە هەڵسوکەوت بکات، لەو ڕوانگەیەشەوە نووسراوێك بۆ والی بکرێت، لەگەڵ نامەی والی وەرەقەیەکیش لە شێخانی خالیدی بنووسرێ، ئامۆژگاریی تێدا بێت کە بەدرخان بەگ زۆر بڕوای پێی هەیە، ئەگەر لە وەڵامدا میری ناوبراو و لایەنگرانی داوای لێبوردن نەکەن، ئەوە خەڵکی لێیان دوور دەکەوێتەوە، هەتا ئەگەر قسەشیان بڕوا، بەپێی ئەوەی سەرەوە و هەواڵی هەواڵگری بەڵگە هەیە کە تیپێك لە لای ناوبراو و لایەنگرانی خۆیان شاردۆتەوە، ئەوەش هەراسانیی لای سەرفراز و بەختەوەر مەلامان سوڵتان دروست کردووە.

لەسەر ئەوەی خستمانەڕوو، ئەنجوومەن بەباشی دەبینێ دووبارە نووسراوی بۆ بنێردرێ، داوای لێ بکرێ بەپێر لێبووردنی سولتانەوە بێ، نوسخەی ئەو نامەیەش بۆ سولتان بەرز بکرێتەوە، لەدوای ئەوە نامەیەك لە عەتوفە والیی بەغداوە هاتووە، لەو نامەیەدا دەڵێ کوردەکان لە ڕووی مەعنەوییەوە یەکیان گرتووە، دەروبەری بەغدا پڕە لە کورد، ئەگەر ئەو کوردانە ببزوون، ئەوە لە ماوەی چالاکی سەربازی دژی میری ناوبراو، ناردنی هێزێکی نیزامی بەسە بۆ دەورووبەری هەولێر هەتا لەژێر کۆنترۆڵی زەبردا بمێننەوە.

ئەنجوومەن ئەو سەرنجانە تەماشا دەکات کە لە نامەکەدا هاتووە و دەڵێ لەپاڵ خۆبەگەورەزانین و بێ ئەمەکی بۆ سەڵتەنەت، لەپشت ئاریشەی ناوبراوەوە هۆکار هەیە بەڵام بۆ ئەوەی لایەنی پێوەندیدار تەماشای بکەن نوسخەیەکی ئەو نامەیەمان بۆ ناردن، لەگەڵ نوسخەیەك بۆ موشیری سوپای هومایونی، هەروەها وڵامی سوپاسی والیی ناوبراویشی لەگەڵدایە، ئەو یاداشتنامەیەمان ئامادە کردووە هەتا ڕێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر، هەروەها بە ڕێگەی وتەبێژی باڵاوە بۆ جێبەجێکردن فەرمان دەردەچێت.

**٩ی جەمادیی دووەمی ساڵی ٦٣ / ٢٤ی مایسی ١٨٤٧**

عەریزەیەك لەزانایان و پیاوچاکان و پێشەوا و وتارخوێنان و پیاوماقوڵ و ناوداران و خەڵك و ڕەعییەتەکانی شاری وانی پاسەوانەوە:

روون و ئاشکرایە ئەو ڕق و زوڵم و بەرەنگارییەی تووشی ئێمەی بەندەی هەژار هاتووە، هیچی بەدەستەوە نەهێشتووین و ناتوانین ئەوەی داوامان لێ کراوە بیدەین و پێشکەش بە خەزێنەی خاوەنپایەی بکەین، لە تواناماندا نییە ئەوەی بەڵێنمان دابوو جێبەجێی بکەین، ناتوانین ئەمەکدار بین بەبەڵێنەکانمانەوە، هەژاری و نەبوونییە نەك (پەنا بەخوا) یاخیبوون، هەموو ئەو فەرمانبەرانەی دێن دەمانترسێنن، هەڕەشەمان لێ دەکەن کە بە شمشێری سولتان لەگەردنی خۆمان و خانەوادە و منداڵەکانمان دەدەن، هەرچیمان هەبووە تاڵانیان کرد، ترس و تۆقاندنیان لەنێو ئەو هەژانە بڵاو کردۆتەوە، بۆ باشترکردنی داهاتی ویلایەتی ناوبراو قائمقامی موش عەتوفە (شەریف بەگ)یان نارد، لە میرەکانی شارە و لە خێزانێکی شەریفە، دەفتەردار ئەفەندیی دەوڵەت ڕایسپارد و

وەکالەتی تەواوی دایە هەڵسوکەوتی باشمان لەگەڵ بکات و بەزەیی پێماندا بێتەوە، ئێمە متمانەمان بە میری ناوبراو هەیە، پیاوێکی بەئەزموونە و لەباری ناوچەکە ئاگادارە.

خەڵك پیان وت بە هەژاری ناتوانین ئەو ئەندازەی لەسەرمان دانراوە ئەو پێنج هەزار قروشە بیدەین، پەیمانیان داینێ سێ هەزار قروش بە شێوەی قیست بدەین، ئەمەش لە تشرینی دووەمی ساڵی شەست و دوو لە وان و ئەو قەزا و ناحیانەی مەحمود خان بەڕێوەی دەبات بەبێ خواستەکانی میری، هەتا بەدوو قیست ئەو پارەیە بدەین ئەم عەریزەیەمان بۆ موقامتان بەرز کردەوە، تکایە داواکاری ترمان لێ مەکەن.

بە ئیمزای ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناودار و زانا

## بۆ مەقامی سەدارەتی سامی:
## (٢٨ مایسی ١٨٤٧ز)

روون و دیارە لە حاڵەتی گرتنەبەری ڕێوشوێنی دروست و بڕیار لەسەردراو بۆ لابردنی کێشەی ناوبانگخراپ، بەدرخان بەگ، ناوبراو لەبەرامبەر بەهێزیی حەزرەتی مەولامان سوڵتاندا ناتوانێت بەرگری بکات، بەناچاری پەنا دێنێتە بەر دەوڵەتی عیللیە یان هەڵدێ بۆ ئێران، بەڵام ئەو زیاتر لە فڕوفێڵان دەگرێ، بە پشتیوانیی (خوا) ڕێگەیەکی دی هەیە بۆ لابردنی ئەو کێشەیە، پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات لای مەقامی باڵاتان دیارە تایفەی کوردان لەچەند هۆزێکی جیاجیا پێك هاتوون، هەموو ئەو ناوچەی ئێستا میری لێیە بە تەواوی سێ بەشی ناوچەکانی عیراقە، ئەگەر داوایان لێ بکرێت بەدابەشکردنی خەڵکەکەی لە تایفەی ناوبراون، لەو سەرنجە بەدوور نییە پێوەندی ڕەچەڵەك لەنێوان ئەمانەدا هەیە و کردوونییە یەك لاشە، ئەگەر بەشێکی تووش بێت هەموو بەشەکانی دیش دەگرێتەوە، لە ڕووی ماددی و مەعنەوی یەك دەگرن، هەتا ڕەسوڵ پاشای ڕەواندزی و ئەحمەد پاشای سلێمانی لێرە هێندە ناکۆك بوون بە ئاوی گەرم ماوەیەك بمان کوڵاندبان مەحاڵ بوو یەك بگرن، لەکاتێکدا ساڵی پار ناردمانن بۆ سلێمانی کەچی بەیەکدا هەڵنەشاخان و بوونە دۆست و ڕێککەوتن، بەقسەی ئەوانەی لێیانەوە نێزیکن ئەو دوو پیاوە لەیەکەوە نێزیکن و لە نهێنیی یەکتر ئاگادارن، لەسەر ئەو ئاراستەی بۆم ڕوون کردیەوە دەورووبەری بەغدا جمەی دێت لە کورد، بە تایبەتی ئەیالەتەکانی سلیمانی و کۆیە و هەریر و ڕەواندز، بەم نێزیکانە چوونەتە چوارچێوەی گوێڕایەڵیی ئەو، ڕەسوڵ پاشای لێپرسراوی چالاکیی پێشووی ڕەواندز بە هەموو لایەکدا دەسووڕێتەوە، سەعدونی شێخی عوبێد و شێخی جەربە لە بازنەی گوێڕایەڵیی ئەودان، لە دەورووبەری بەغدا و موسڵ تەنگ بەیەکتر هەڵدەچنن و لەگەڵ میری ناوبراو لێك تێگەیشتن و یەکگرتنیان هەیە، ئەگەر بەهاندانی ئەمیری ناوبراو هەڵبگەڕێنەوە ئەوە هێزی پێویستمان لەسەرباز لەبەردەستدایە، هەم بۆ سەرکۆنە و تێکشکاندن، هەم دەتوانین ڕێگەیان لێ بگرین و نەیەڵین پشتیوانیی میری ناوبراویان پێ بگات، لە لایەکی ترەوە باری ئەو چالاکییە سەربازیانە سووك دەکەن کە لەشکری ئەنادۆڵی هومایوونی ئەنجامی دەدەن.

دەتوانین بەشێك لەو هێزە نیزامیانەی لای مــن بــەرەو شــوێنی قەیرانەکــە بــەرین، پێویستە بەشێك لە هێزەکان بــەرەو هــەولێر بــەرین کــە قەزایــەکی بەغدایــە و دوانــزە کاتژمێر لە بەغداوە دوورە، بە پشــتیوانیی (خــوا) مــیر هەرچــەند هێــز کــۆ بکاتــەوە، ناتوانێت بەرانبەر لەشکری سوڵتان بەرگری بکــات، هێــزی ســەرکەوتوو هــی حــەزرەتی مەولانا سوڵتانە، ئەزموونی ڕۆژانی ڕەشید پاشای (خوا) لێخۆش بوو بەتایبەت بۆ ئــەو بەدڵنیایی سەلماندی بەرامبەر دوو تابوری سەرباز لە زەوی دەشتایی دەدۆڕێن، هەرکاتێك هێزەکان لێیان نێزیك ببنەوە بەرەو چیاکان پاشەکشە دەکەن.

هەرچەندە بتوانێت کوردان لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، هەندێکیان ناچار دەبــن لــە چیاکانەوە بۆ کۆکردنەوەی بەرهەمەکانیان بێنە خوارێ و هەندێکی دیش بۆ بینینی کوڕ و منداڵەکانیان، وا باشترە بەیەك جار سوپا بەرەو گوند و شارۆچکە و ڕێڕەو و پردەکــان ڕەوانە بکرێت، ئەوانە لــە چــیاکان گــەمارۆ بــدرێن، بــە سروشــتی خۆیــان نــاتوانن بــۆ ماوەیــەکی زۆر لــەوێ بمێننــەوە، هەنــدێکیان دێنــە خــوارێ و داوای ئــەمان دەکــەن و هەندێکی دیکەیان بلاوەی لێ دەکەن و مــیری نــاوبراویش دەمــێنێ یــان داوای ئــەمان دەکات یان هەڵدێ، ئەوکات بەرژەوندیمان بەئاسانی دێتە دی، دوایی دەتــوانین بەرپرســی حکوومی لەو ناوچانەی ژێردەسەڵاتی میری ناوبراو دابنێین، بەمەرجێك هێزی تــەواو لــە سوپا لە شوێنە پێویستەکان هــەبێت بــۆ دابینکردنــی کــاری پۆســتە و پارێزگــاری لــە نەوەکان، تکایە بۆ ئاگاداریتان، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمر و چاکەکارە.

**١٣ی جەمادیی دووەمی ساڵی ٦٣ (١٨٤٧ز)**

**والیی بەغدا**

## (کۆتایی بەڵگەنامەکان)

ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی پەڕاوێزەکان سوودیان لێ وەرگیراوە:

- جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەلتووریی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، و: لە ڕووسییەوە، ئەنوەر قادر، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣.

– جليلى جليل، والاخرون، الحركة الكردية فى العصر الحديث، ت. عبدى حاجى، دار الرازى، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٢، ص٢٠.

- ڕەفیق حیلمی، یادداشت (کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود)، چاپخانەی ڕۆشنبیریی لاوان، ١٩٨٨، بەشی یەکەم.

- سەلاح محەمەد هروری، عبدالرزاق بەدرخان (١٨٦٤-١٩١٨ز)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی٢٠٠٥.

– سەعدی عثمان هروتی، كوردستان والامبراية العثمانيية، مطبعة خانى، الطبعة الاولى، دهوك، ٢٠٠٨.

- شازادە نادر میرزای قاجار، ڕاپەڕینی شێخ عبیداللەی نەهری و هەمزاغای مەنگوڕ، و.محەممەد ئەمین بیژەنی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ١٣٨٩ی هەتاوی.

- عەبدوڵا عەلیاوایی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، لـە ناوەراسـتی سەدەی نۆزهەمەوە تا جەنگی جیهانیی یەکـەم (لێکۆلینەوەیەکـە لـە بـواری مێـژووی سیاسیدا)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- علی ئەکبەر سەرهەنگ، شۆرشی شـێخ عبیداللـەی نـەهری لـە بەڵگەنامـەکانی کاروباری دەرەوەی ئێراندا، و. **محەمەدی حەمە باقی**، چاپی یەکەم، هەولێر، **٢٠٠٧**.
- علی ئەکبەر سەرهەنگ، شۆرشـی شـێخ عبیداللـەی نهـری لـە بەڵگەنامـەکانی قاجاریدا، و. **محەمەد حەمە باقی**، دەزگای ئاراس، **٢٠٠٧**.
- **محەمەد** ڕسول هاوار، **سمکۆ** (ئیسماعیل ئاغای شوکاك) و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێك، سوید، **١٩٩٥**.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم (مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئێـران)، چاپخانەی ڕوون، چاپی سێیەم، سلێمانی، **٢٠٠٥**.